مەسعوود محەمەد

«نووسەر، نووسین و ئازادی»

ئەم کتێبە بریتییە لە دوو دیمانەی مامۆستا،

- یەکەمیان «کۆڕێک بۆ مشتومڕی بیروڕا» لە لایەن «سەلیم شەریف» ـەوە ساز کراوە و ڕۆژنامەی «ئەلقادیسییە» سەرەتای 1989 پەخشانی کردووە.
- دووەم دیمانە دەستنووسە، نە کاتی دیارە نە دیمانەساز: «نووسەر، نووسین و ئازادی».

تەرجەمەی لە عارەبییەوە: سایتی مامۆستا www.mamosta.net

دیزاینی بەرگ: م. زانکۆ

ستۆکهۆلم پاییزی 2013

## کۆڕێک بۆ مشتومڕی بیروڕا...[1]

---

1- «کۆڕێک بۆ مشتومڕی بیروڕا / ندوة في جدل الأفكار» دیمانەی «سەلیم شەریف / سليم شريف» لەگەڵ مەسعوود محەمەد، ڕۆژنامەی «ئەلقادیسییە / القادسية»ی عیراقی بە زمانی عارەبی، بە چوار بەش بڵاوی کردۆتەوە، بەشی یەکەم 15-01-1989، بەشی دووەم 22-01-1989 بەشی سێیەم 29-01-1989 و بەشی چوارەم 05-02-1989.

تەرجەمەی لە عارەبییەوە سایتی مامۆستا www.mamosta.net ستۆکهۆلم – پاییزی 2013.

سەرلەبەری پەراوێزەکان زادەی ئەم تەرجەمەیەن.

## بەشی یەکەم

مەسعوود محەمەد لە ماوەیەکی یەکجار کورتدا لە دڵی خوێنەراندا هەڵکشا و گەیشتە باڵاترین پلەی خۆشەویستی، چاوەنۆڕی، تامەزرۆیی گەرم و گەڕان لەدووی وشەیەکی ئەو دەینووسێت، یان کتێبێکی دایدەڕێژێت و پەخشانی دەکات. ئەم خوێنەرانە، بە هەموو چینیانەوە، لەم نووسەرە کوردە، زمان درەوشاوە و دەروون گەشە، جۆرە باوەڕێک دەبینن لای نووسەرانی ئەم سەردەمە بوونی نییە، جۆرە مرۆڤێکی نووسەر دەبینن نموونەی نییە مەگەر دەگمەن. گشت پیتێکی ئەم مرۆڤە ویژدانێکی ئاگایە، هەموو ڕستەیەکی نووسینەکانی هەم مشتومڕ ساز دەکەن هەم هۆشیاریی لە مشتومڕ. مێژوو دەچێنن، مێژوویەکی وەها دەروون ڕادەچەنێت و دەروون هەڵدەچنێت.

لەم کۆڕەدا پێمی دەگوت، چۆن ئاو لە سەرچاوەوە هەڵدەقوڵێت، شێوازی نووسینی من وەها لە زاتی خۆمەوە سەر دەکات. مەبەستیشی ئەوە بوو چۆن ئۆکسیژین و هایدرۆژین لە پێکهاتەی ئاودا دابینن، هەر لە سەرەتاوە خۆراکێکی فەرهەنگیی بۆ دابین کراوە، پاشان بە دەم ئەزموونی نووسینەوە ئەم خاڵانە پەیدا بوون:

1. ململانێیەکی نێوەکیی درێژخایەن بۆ هەڵبژاردنی ئەو ڕیشاڵانەی ڕاستیی پەتیی دەپاڵێون، هەر وەک پاڵاوتنی ئاو کە ڕێژگەی چەم لە هەناوی زەوییەوە بەدەم دزە کردنەوە بۆ دونیای ئاشکرا تەواو ڕوون دەبێتەوە.
2. فراژووتنی هاوشان و هاوکاتی شێواز و نێوەڕۆک لە ناخیدا، هەر دەڵێیت خۆی داوەتە دەست ماکی خۆی و بێ دەستتێوەردانی ئاگایی دەستەواژەی تەواو ڕسکاوی پێ دەنووسێت وەک ئاو چۆن لە ڕێزگەیدا بەرەو کانی جلەو دەداتە دەست سروشت.

3. باوەڕی بەوەی دەینووسێت بەردەوامبوونی باوەڕیەتی بە مافی خۆی لە دەربڕینی بیروڕادا. کات بەفیڕۆ نادات بۆ خۆ ڕاهێنان لەسەر ئازایەتیی ئەدەبی بۆ گەیشتن بە دەربازبوون لە نیگەرانی، لەبەر ئەوەیە سەختیی زان نایەتە ڕێی بەرژانی نووسینەکانی تا ببنە هۆی فڕیدانی مەلۆتکەی نەوزاد بە نیوەگیان... گەر دەرفەتمان بۆ ڕەخسا لێی بخوێنینەوە دەبێ خوێندەوەمان ورد بێت، چونکە مەسعوود محەمەد نە زمانی هاسانە نە ناوەڕۆکی. بیرۆکەی خۆی بە یەک جار ئاشکرا ناکات. ئەم قووڵییەی نووسەر لە شێوازی نایاب و تایبەتەوە کڵپە دەکات، داوای ڕامان و هێمنیمان لێ دەکات. بنەماکەشی بریتییە لە: گفتوگۆیەکی ئارام لە نێوان خوێنەری جیددی و نووسەرێکی تەواو خەباتکار لە جیدیبوونی باوەڕدا...

خوێنەرانی تۆ کێن؟

دەچینەوە لای و لێی دەپرسین: چی دەزانیت دەربارەی خوێنەری خۆت؟

خوێنەرانی من فرەجۆرن، هەیە نەیارە، بە گشت نووسینێکم هەناسەی سوار دەبێت. هەیە، بێ چ هۆیەکی من دەربارەی خۆمی بزانم، دڵڕەش و بوختانکاری لای دەسەڵاتە.[2] هەیشە هەراسانە چونکە لەو باسانە نادوێم ئەو پێیخۆشە. هەیە تەماشاچیی پەسەندکار، هەیە تینووی نووسینەکانمە و چاوەنۆڕ. هەست دەکەم ژمارەی ئەو ڕۆشنبیرانەی لە نووسینەکانم دەگەڕێن زیاد دەکات. خەڵکی ساکار لەو لاوانەی بە پەیژەی فەرهەنگیدا هەڵدەکشێن، بەتایبەتی لە کورد، لە نێوپێوی[3] خوێنەرانمدا ئێستا بەرهەستن. ئەمانە داواکارییان زۆر بووە لە نموونەی بەرهەمەکانم واژووی خۆمی لەسەر بێ، منیش دەیاننێرم بۆ لاوانێکی نەدیوو.

نێزیکە دوو سەد و پەنجا نموونەی دوا بەرهەمم بە ناوی «بۆ گۆرباشۆڤی مەزن: لەگەڵ سڵاو و هیواخوازیدا»[4] بە دیاری چوون بەر لەوەی یەک فلس لە داهاتی کتێبەکەم بێتە دەست. ئەمەش نوکتەیەکی هێنایەوە یادم کە دەڵێ بابایەک سەرەدانی دۆستێکی

2- بوختانکاری لای دەسەڵات: «واش».

3- نێوپێو: حجم، قەوارە.

4- مسعود محمد، «إلی العظیم غورباتشوف: تحیة ورجاء»، بغداد - 1988. ئەم کتێبە لە لایەن حەکیم کاکەوەیس - ـەوە بە سەردێڕی «بۆ گورباشۆڤی مەزن: لەگەڵ سڵاو و هیواخوازیدا» تەرجەمەی کوردی کراوە، بڕوانە بەشی کتێب، سایتی مامۆستا: www.mamosta.net

نیگارکێش دەکات لە ستۆدیۆکەی، دەبینێ پڕیەتی لە تابلۆی نایاب. میوان بە هونەرمەند دەڵێ دیارە کاتی خۆی باشت لێ فرۆشتوون. نیگارکێش لە وەڵامدا دەڵێ: بەڵێ، ئەمڕۆ کۆت و کراسێکم فرۆشت. بەڵام دوا بەشی بەرهەمەکە لە دەستپێکی باشتر بوو، کتێبەکان لە بازاڕدا نەمان مەگەر چەند دانەیەک نەبێت لای خۆم گلم دانەوە...

ئەو خوێنەرانەی باوەڕیان بە دروستیی نووسینی من هەیە ترسی ئاشکرا کردنی لایەنگیریان بۆم بە نووسین نەشکاندوە. یەک لە هۆکارەکان دەگەڕێتەوە بۆ ملکەچییەکی درێژخایەنی چاپەمەنی - بەتایبەتی کوردییەکان - و مەڵبەندی فرۆشیارییان بۆ بیرۆکەی وەها کە لە دەراوی[5] ئایدیۆلۆژییەوە نووسینەکانم دەدزێنن.

لەم بوارەدا تا ڕادەی شادمانی بە بەشی خۆم ڕازیم چونکە گەر بەختی خۆم لە ماڵی ئەم دونیایە بەسەر بکەمەوە دەبینم لە برەوی نووسینەکانم بەختێکم هەیە لە هیچ بوارێکی دیکەدا نموونەی نییە...

بەرداشتی **خوێنەران**

**ئەدی خوێنەران بەرداشتیان لە تۆ هەیە؟**

لای زۆربەی ئەو خوێنەرانەی بە دیداریان گەیشتووم - ژمارەشیان لە نێو جەوانی کورددا کەم نییە - پتر لە چاوەنۆڕیی خۆم، لایان پەسەند بووم و تاکوتەراشیان تێدا بوو بڕگەی سەرلەبەری نووسینی منیان ئەزبەر بوو.

لە چینی ئوستاد و ئەدیبان، لە ناکاو دۆخی وەها دەهاتە پێش، وەک تارمایی دەهاتنە خەیاڵ هەتا لە ناکاو پەیدا بوون: ئوستادی خاوەن

5- دەراو: سەرشار - منطلق.

دوکتۆرا، پاش هەفت ساڵ لە ئەمەریکا بۆ تواناسازی و بنگەدانان لە بواری خوێندن و مامۆستایەتیی ئەوێ، بەر لە جێهێشتنەوەی عیراق و گەڕانەوەی بۆ ئەمەریکا - پێم وایە - هاتە سەرەدانم، گوتەی وەها مەزنی دەربارەم گوت لە گێڕانەوەی شەرمەندەم.

«عەبدول مەجید لوتفی - عبد المجيد لطفي»[6] ی مامۆستام - تەمەندار بێت - هەرچەند لە خەڵوەتگەکەی خۆی سەرەدانی دەکەم تای تەرازوومانی ئازوگوێز[7] دەکرد. ئوستانداریک لە ئوستانێکی دوورەوە کەسێکی - لای من نەناس - ناسیاری خۆی ڕادەسپێرێت بێت و کتێبێکی «... گۆرباشۆڤ ...» لەگەڵ پێشکەشی واژوواداری منەوە بۆ داوا بکات. کەسی ناوداری دارا هەیە هەزار نموونە لە یەک لە بەرهەمەکانم دەکرێت بۆ ئەوەی بیانکاتە دیاری خۆماڵی بۆ دەرەوەی عیراق. کوردێکی ڕەوەندی بەغدای خاوەن دەرامەد دێت و خەرجیی چاپی «زمانی کورد»[8] دەگرێتە ئەستۆ... خەڵکی دیکەش لە ژماردن نایەن، بەشێکیان دەبینم، هەیە لێیان دەبیستم و هەیە

---

6- عەبدول مەجید لوتفی - عبد المجيد لطفي (1992-1905): ئەدیب و نووسەرێکی کوردی خانەقینییە و یەکێکە لە دامەزرێنەرانی «یەکێتیی ئەدیبانی عیراق».

7- «ئازوگوێز»: جێگۆڕکێ. مەبەست ئەوەیە لەو دیدارانەدا، عەبدول مەجید لوتفی، لە گەورەیی خۆی جێی مامۆستایەتیی داوەتە مەسعوود محەمەد.

8- مسعود محمد، «لسان الكرد». لە سەر ئەرکی ئەحمەد وەلی هیممەت چاپ کراوە. بەغدا 1987. حەکیم کاکەوەیس ئەم کتێبەی لە ژێر سەردێڕی «زمانی کورد»ساڵی 2010 تەرجەمەی کوردی کردووە. بڕوانە سایتی مامۆستا www.mamosta.net.

دەنگوباسیان پێم دەگاتەوە، ئەمانە بۆ هەر مرۆڤێک باش و بەد جودا بکاتەوە، شادمانییە.

پێشم وەها نییە ئەو خەڵکە بە نووسینەکانم فریو درابن چونکە لێکدانەوەیەکی ڕاستگۆن لە ویژدانی خۆم بۆ گوتەی بەرخوێندنەوە.[9] هەر دەڵێی - لەخۆڕا - سەهوو دەکەن لە پێوانەی شاراوە و ئاشکاری سروشتم، من لە خانەی خۆمدا فریشتە نیم، بەڵام لە هەموو ژیانمدا خۆم بەرز ڕاگرتووە لەوەی دەرفەت وەرگرم و کەسێک ناچار بکەم بە شتێکی دژبە ویستی خۆی.

هەرگیز کەسم فریو نەداوە.

## نەوەی سێیەم

## گەر بڵێین نووسەرانی عیراق سێ نەوەن، خۆت لە کوێدا دەبینیتەوە...؟

لەوانەیە بڕیاری مرۆڤ لەسەر خۆی لە وەڵامی پرسیاری لەم جۆرە سەخت بێت مەگەر مەبەست لێی پێگەی زەمانی بیت کە تەمەن پێشانی دەدات. لەم ڕوانگەیەشەوە من دەچمە خانەی نێوەڕاستەکانی نەوەی سێیەم، واتە نەوەی کۆن. بەڵام گەر مەبەست لێی دیاری کردنی فەرهەنگی من بێت لە پەیژەی زەمانیدا کە هەڵدەکشێت، ئەوا من بڕوایەکی دابڕی گومانبەدەرم هەیە لەوەی خۆراکی من لە زانیار[10]ی ئەم سەردەمەوە و سەردەمەکانی زووتر، ئەوجا سروشتی

---

9- «بەرخوێندنەوە»: «مقروء/قابل للقرائة» - بۆ وەکارهێنانی پێشگری «بەر» بە واتا «قابل لل ...» بڕوانە «زاراوەسازیی پێوانە»، لاپەڕە 47.

10- «زانیار» واتە «معرفة» Knowledge - ئەم زاراوەیە هەر خۆیەتی لە «کۆڕی زانیاری کورد» دا هەیە. زانیار لە ڕێژەی پرسیار، بڕیار، کردار،

خۆم کە هەر خۆڕسک وەهام، جێگەم دەکاتەوە لە نێو هەر نەوەیەکی ئایەندەدا کە بگاتە شائامانج، ئەویش: بڕوایە بە سەروەریی مرۆڤ، بە ئازادی و مافی ڕەهای مرۆڤە بەوەی دەبێت خۆی سەرداری خۆی بێت.

من بە دڵ و بە هۆش لە زەمانێکدا دەژیم هەم لە زۆرداری بەدەرە هەم لە ملکەچی. دروشم و نیشانی تێدا کوژاونەتەوە، نە ڕیزبوونی پاسەوانی سەروەریی[11] تێدایە نە هەڵاویردنی ئەم لەو. بۆ جڤاکێک دەخەبتم دەستدرێژیی تێدا نەک هەر مایەی قانزاج نەبێت بگرە دەرفەتی بوونیشی نەبێت. ئەم خەباتەش دوو ڕێگەی هەیە، هەم بە نووسین و هەم بە ڕەفتار. من هەردووکیانم گرتۆتە بەر: هەرچی نووسینە ئەوا خوێنەر لێی ئاشنایە. بۆ ڕەفتاریش بەسمە بڵێم لە هۆتێلەکەی هەوارگەی پیرمام شۆفێری گەڕۆکی[12] «کۆڕی زانیاری کورد»، گیانشاد «عەلی زغیر» لەتەک خۆم و دۆستانم لە دەوری مێزی خواردن دادەنیشت. پێش ئەوەش کاتێک وەزیر بووم، لە چەند گەشتێکمدا بۆ شاری کۆیە، شۆفێری «وەزیری دەوڵەت»[13] لەگەڵ خۆم لە یەک خوان نانی دەخوارد. ئەم کارانەشم تەنها بۆ خۆم دەکرد، نەم دەسەپاند بەسەر ئوستاندار (پارێزگار)، وەزیر، ناودار و پێگەداری دیکەدا چونکە مافی ئەوەم نییە... لەم گوتەیەشمدا تەواو بەپەرێزم لە خۆهەڵدانەوە چونکە دەرکی چڕم بە شکۆمەندیی مرۆڤایەتیی خۆم و

---

گوتار... ە و جودایە لە وشەی «زانیاری» کە بۆ «معلومات» ڕۆیشتووە و زۆر جاریش لە بواری سیخوڕیدا بەکار دەهێنرێت.

11- «پاسەوانی سەروەری»: «حرس الشرف».

12- «گەڕۆک»: ئۆتۆمۆبیل، «سیارة»، بڕوانە «زاراوەسازیی پێوانە»، لاپەڕە 40.

13- «وەزیری دەوڵەت»: «وەزیر الدولة» - واتە وەزیری بێوەزارەت.

مرۆڤایەتیی خەڵکی دیکە ئەو چڵکە سەرکەوتەیە[14] دەکرێنێت لە ڕووی هەبوونی فرەوانتر کە بریتییە لە ڕسوایی هەم خۆهەڵدانەوە و هەم خۆشکێنی[15].

**چەمکی سیاسی!**

**مامۆستا مەسعوود[16]... بیروڕا دەربارەی تۆ فرەجۆرن، هەیە تۆ بە نووسەری کۆنەپەرساتیەتی دەزانێت، هەیە بە نووسەری شۆڕشگێڕەتی. ئایە زاراوەی لەم بابەتانە تۆ دەگرنەوە؟**

مرۆڤایەتی بەگشتی تێر بووە لە خێروبێری کلێشەی بێژەکیی[17] وەها پەکخستە و گومڕاکار. ئەمەی گۆیا «شۆڕشگێڕی»یە پێویستی بە پێداچوونەوەیەکی جیددی هەیە، هەم چەمکی و هەم واتای. ئەم «شۆرشگێڕی»یە نیازی چییە بیکات بە هۆشی خەڵکانێک لە تەمەنی

---

14- «سەرکەوتە»: ئەوەی لەبەر سووکی بۆ سەرەوە هەڵدەکشێ - بڕوانە «زاراوەسازیی پێوانە»، لاپەڕە 60.

15- «خۆهەڵدانەوە» و «خۆشکێنی» بەرانبەر «تکابر» و «تصاغر» هاتوون.

16- سەلیم شەریف لەم دیمانەیەدا «شیخ مسعود» بەکار دەهێنێت. ئەم «شیخ» ی عارەبییە لێرەدا بۆ ئوستاد و کەسایتی هەرە بەرزی زانست دێت، بۆ نموونە زاراوەی «شیخ الازهر» و «شێخ الاسلام» گەورە و سالاری پێشان دەدات. هەڵبەت لە کوردیشدا زوو واتای لەو بابەتەی هەبووە بەڵام ئێستا و بەتایبەتی لە کەشی سیاسیی ئەم زەمانەدا وشەکە واتایەکی دیکەی پەیدا کردووە بۆ کەسایەتیی مامۆستا و ئەم گوتارە بەرزە دەست نادات. لەبەر ئەوە لەم تەرجەمەیەدا «مامۆستا» جێی گرتەوە.

17- بێژەکی: لفظي.

فێرخوازیدان و بە ژمارە دەبنە زۆرینەی کادێری بزووتنەوە توندڕەوەکانی پێیان دەگوترێ شۆڕشگێڕ؟

زووتر چەمکی «پێشڕەوتی» ناسنامەیەکی دەربازبوونی سانا بوو بۆ کەسانی خۆ بە پێشڕەوت زان پێی دەرباز دەبوون بۆ دونیای خۆنازین، باڵەفشێ و خۆبەگەورەزانی. بۆ ئەوەی لەوێوە بە سووکی بڕواننە زۆربەی کەسانی بەرهەمهێنی ڕاستینە[18] و هەڵگرانی ئەرکی ژیار لە ڕێی تاوانبار کردنیان بە بەرخۆری[19]، کۆنەپەرستی و سەربە جۆرەکانی بۆرژوازیبوون لە گەورەیەوە، بۆ مامناوەند و بچووکیەوە. کەچی ئەم «پێشڕەوت»ـە کە دێتە سەر پێشخستن، ژیاراندن و ڕۆشناندن[20] جگە لە گوتاری کلۆر[21] و ڕازاوەی ورووژێن چ دەستاوێژێکی دیکەی نییە.

کاتێکیش «شۆڕشگێڕەتی» دەبێتە باو، ئەوجا خۆبەزلزانین دەبێتە مۆدێلێکی جێماو لە ڕەفتارگەلی «نۆرەی مێژووکرد»ی داواکراو لە منداڵی هەراش و هەرزەکار و هاندەرانیان لە کەسانی سەرگەرم و تینوو بە سەرەوژێر کردنی دونیا. دونیاش بۆ چاوی بینا ئاشکرایە، دەبا بێت و بارودۆخی سوێد، دانمارک و سویسرە بەراورد بکات بە بارودۆخی وەڵاتانی شۆڕشیان تێدا هەڵگیرسا. جا گەر مەبەست لە «شۆڕشگێڕی» ئەم واتایە بێت کە ئاماژەی هەیە بۆ سووتاندن، کوشتن و لەرزاندنی کۆڵەکە دەبێ چ شانازییەکی تێدا بێ بۆ هەڵگری

---

[18]- ڕاستینە: حقیقي.

19- بەرخۆری: إستغلال.

20- «پێشخستن، ژیاراندن و ڕۆشناندن» بەرانبەر «التقديم، التحضير والتنوير» هاتوون.

21- «کلۆر» لێرەدا بەرانبەر «أجوف» هاتووە.

ئەو نازناوە و چ کەماسییەکی هەبێ بۆ کەسێک خۆی لێ بێبەری بکات.

من مرۆڤێکم باوەڕم هەیە بە هێز و پاکژیی[22] «ژیار» ئەویش تەواو دوورە لە لێکدانەوەی گۆمڕاکار. شکۆمەندترین لایەنیشی «سەروەریی مرۆڤ» ـە کە خۆی لەسەر بنەمای «هەڵبژاردنی ئازاد» ڕاگرتووە، چ لێڵییەکیش لە واتای «سەروەری» و «ئازادیی هەڵبژاردن»ـدا نییە.

## هۆکاری بەهرە

## بەشێک لە ئەدیبان دەپرسن: مەسعوود محەمەدی کورد ئەم شێواز و ڕەوانبێژییە عارەبییەی لە کوێ پەیدا کرد؟

پاش ڕێزم بۆ دڵڕاگریی نێو پرسیارەکەی ئەو ئەدیبانە دەڵێم ڕەوانبێژیی من دیاردەیەکی سەیر نییە لە نێو خەڵکدا، دونیا کەسانی زۆرە خاوەن ڕەوانبێژیی گەش و بێگەرد. لە ڕابردووی دووریشدا هەبووە لەم هونەرەدا گەیشتۆتە ڕادەی توانابەدەرا![23]

ئەوەی توانای دامێ ببمە خاوەن دەربڕینی [...] ئەوەندەی خۆم بناسم [...] هۆکارێکە سروشتی و هۆکارێکی دیکەیە ناتوانم وەسفی بکەم. هۆکاری سروشتی ئەوەیە من دەرکێکی خۆڕسکم هەیە بۆ ڕێکخستنی لەبار [...] پیتەکان، واتە «دەنگی زمانەکی»، بۆ هاوئاهەنگیی دەنگ و هاوئاهەنگیی ڕستە [...] هەر وەک «وەستا» ی بیناساز چۆن وردەکارە

---

22- پاکژی: فضيلة. بڕوانە «لیستەی زاراوەکانی فەلسەفە و ژیربێژی» - «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کوردی»، ژمارە 4 ساڵی 1974 - مەسعوود محەمەد، «زاراوەسازیی پێوانە»، لاپەڕە 469. سایتی مامۆستا: www.mamosta.net

23- توانابەدەر: إعجاز.

لە ڕێکخستنی بەرد و خشت لە هەڵبەستنی دیواردا، هەم ڕێکی هەڵدەبەستێ و هەم لە کەرەستەشدا ئابوورە،[24] جار هەیە تاکە وشەیەکی ڕاگەیەن لە ڕستەدا جێی دەستەواژەیەک دەگرێتەوە.

هەر بۆ ڕوون کردنەوە دەڵێم زیاد لە دە ساڵ لەمەوبەر باسێک دەربارەی ئەم بابەتە هاتە پێش، بۆ پێشاندانی جوانیی داڕشتن لە گوتارێکی سەرەتای شێستەکانمەوە دەستەواژەیەکم بە نموونە هێنایەوە:

*«والتمع بارق الفرند من المناجل المشحوذه وهمت أن تحصد من الهام والمعاصم والأقدام بيادرا لمحصول العام بلا تفريق بين آثم وبرئ».*

*«بریسکەی دا تیشکی شمشێر لە دەمەداسە تیژکراوەکان و هاتە دروێنەی دوند و زەند و پێ بۆ خەرمانی ساڵ بێ جیاوازیی لە نێوان تاوانبار و بێتاواندا».*

و گوتم گەر چەند وشەیەکی لێ بگۆڕم، بۆ نموونە دەستەواژەکە ببێتە: «... وهمت أن تحصد من الرؤوس والأيدي والأرجل...» / «... و هاتە دروێنەی سەر و دەست و قاچ...»، مامۆستا «عەبدول مەلیک ئەلئەعززەمی - عبدالملک الأعظمي» قسەی پێ بڕیم و گوتی: «دەبێتە کەلەپاچە»! دروستیشی پێکا.

ئەو هۆکارەی پێم وەسف ناکرێت: باوەڕێکی پتەوی ناخی خۆمە بەوەی جوانیی سنووری نییە. هەتا جوانی پێشکەش بکەیت جوانیی زیادتر بەڕێوەیە. ئەم باوەڕە بۆتە بەشێک لە بوونی خۆم، نایەم هەر جارێک دەستم دایە نووسین سازی بکەمەوە، تاودەرێکە هەستی پێ دەکەم

---

24- کورد دەڵێ: «خابوورە بە ئابوورە» - واتە گەر وەک ئاوی چەمی خابووریش زۆر بوو هەر ئابوور بە، بەفیڕۆی مەدە.

وەک چۆن هەست بە تەڕایی زمان و فرەپاتبوونی هەناسەم دەکەم. ئەم تاودەرە، لە یەکەم هەنگاوی خامە لەسەر کاخەز، هانم دەدات بۆ ڕێکارێک[25] دڵنیام بەرزترە لەوەی ئەم تاودەرەی لێ بڕا بێت.

دۆخی دەگمەنیش هەیە لە ئاوێتەبوون لەگەڵ بابەتدا و سەر کردنی بەهرەی دەربڕین بە هاوئاهەنگی لەتەک دەربازبوونی گیان لە ڕێبەست و ڕێگر، تێیدا هەست بە دیاردەیەک دەکەم نێزیکە لە «شیزۆفرینیا» Schizophrenia، هەست دەکەم خامەکەم جڵەوی داوەتە دەست ماکی نادیارم...

## لە تاریکییەوە بۆ ڕووناکی

**مامۆستا مەسعوود... کورد هەن دەڵێن: بلیمەتیی[26] مەسعوود محەمەد لە بواری هزردا، لەچاو تەمەنی خۆیدا، درەنگ هاتووە. وەڵامێکی باوەڕهێنی وەها زیانی بۆ ڕازگەلی بەهرەت نەبێ، چۆن دادەڕێژیت؟**

ڕێ بە خۆم دەدەم وشەی «بلیمەتی» لە پرسیارەکە دەرکەم چونکە گەلێک مەزنە. دەبا خاوەن پرسیار خۆی ئەم پرسیارەی ئاڕاستەم بکرادیە، یان دەڵێی پرسیار بە زمانی کەسێکی دیکەوە دەکەیت؟ کێشە نییە... ڕاستینەیەک دەزانم دەربارەی خۆم و ڕەوتی ژیانم لێرەدا ڕوونی دەکەمەوە: لە فەرهەنگ و گەشەی هزریی مندا هیچ بازدان و بزاوتنێکی دابڕ لە دۆخێکەوە بۆ دۆخێک ڕووی نەداوە. لە ڕەگێکەوە نەشونمام کردووە لە کێڵگەی خۆیدا قووڵە، هەر وەک گیا چۆن بە دابین کردنی خاک و ئاو گەشە دەکات.

---

25- ڕێکار: مستوی.

26- لێرەدا چەمکی «بلیمەتی» بەرانبەر «نبوغ» هاتووە.

ئەمەش بڕی بەرچاوە لە گەشەی هەر مرۆڤێک لە باری باودا تووشی دەردی فەرهەنگ بووبێت. بەڵام ئەوەی بۆ من ڕەخسا و بەدەگمەن نەبێت لەخۆڕا نارەخسێت، شتێکە لە هەناودا ڕێک هاتووە لەتەک ئەو شێوازە گوزەرانەی لێی گونجاوە: هەر لە منداڵییەوە ڕژدبوونێکم لەگەڵە بۆ باوەڕهێنان لە ڕێی هۆکاری باوەڕهێنەوە نەک «تەلقین»ی کلۆر. هۆکاری ئەم ڕژدبوونەش بێمێشکی و کەمدەرکیی نەبوو بگرە هۆکاری پێچەوانە بوون.

دەرئەنجامی ئەم خەسڵەتەش ئەوە بوو کاتێک گەیشتمە تەمەنی بیرکردنەوەی جیددی لە نێو خۆمدا هەستم بە ڕسکانێکی پێشکات، توانای ڕەت کردنەوەی جیددی و هەروەها سەلماندنی بیینا دەکرد. ئەمانەش بەرهەمی منداڵی و جەوانیی پرسکار، پەیدۆز و ڕیشەدۆزن. پاش ئەوەی خوێندنی «یاسا»م تەواو کرد، هەفت ساڵ 1952-1945م تەرخان کرد بۆ بیرکردنەوەی چڕ لە بابەتەکانی دونیا، چ بەرخوێندنەوە بن، چ بەربیستن و چ بەرخەیاڵ.[27] زستانانیش زۆر جار هەتا بەرەبەیان بەدەم گفتوگۆی نێوەکییەوە شەونخوونیم دەکرد. ئەمە بوو ئەو شێوازە گوزەرانەی دەگونجا لەتەک مەیلی هەناومدا بۆ دۆزینەوەی بەرسڤی باوەڕهێن لەو بابەتانەی جێی ناکۆکین یان درابوونەوە بە وەڵامی سەپێنراوی وەها نێزیکتر بوون لە گریمانە و سەلمێنەکاری.[28]

---

27- «بەرخوێندنەوە»، «بەربیستن» و «بەرخەیاڵ» بۆ «مقروء»، «مسموع» و «متخیل» هاتوون.

28- «گریمانە» و «سەلمێنە» بۆ «إفتراضات» Assumptions و «مصادرات» Axioms هاتوون. بڕوانە «لیستەی زاراوەکانی فەلسەفە و ژیربێژی» - «زاراوەسازیی پێوانە»، لاپەڕە 495 & 480.

لەم ماوە درێژەشدا بێبەرهەم نەبووم لە نووسینی سۆزداری، سیاسی و فەلسەفی. ئەو بەرهەمانە نە دەرفەتی پەخشان کردنیان بۆ ڕەخسا نە بیرم لێی کردەوە بەڵام بوونە دەروازە و بە ڕووی بابەتی وەهادا کرانەوە دواتر بە پەخشان کردنیانەوە خەریک بووم. لەو دەمەدا ڕاستیی ئەو بۆچوونەم لە لا خویا بوو کە زووتر لە خوێندنەوەدا دیبووم و دەڵێ: «هۆشی ون» هەر دەخەبتێ بۆ دۆزینەوەی بەرسڤی ئەو پرسیارانەی لای «هۆشی ئاگا»ی خاوەنەکەی گیریان خواردووە. خۆم دیتەوە بەدەم تێپەڕبوونی زەمانەوە لە تاریکییەوە دەرباز دەبم بەرەو ڕووناکی و بوومەتە خاوەنی وەڵام بێ ئەوەی خۆمی لەگەڵ خەریک بکەم، هەر لەخۆڕا لە ناخمەوە سەردەکات و دەکەوێتە سەر ڕووی هۆشم. دیارە ئەمانە بڵقن، هۆشی ونم دابینی کردوون و لە کاتی گونجاودا پاش ساڵانێک لە خەریک بوون، ئازادی کردوون بەرەو بانی دەرەکی.

بەشێک لە خەباتی هزریم لە ساڵانی 1954-1953 دەمی نوێنەرایەتیم لە پەرلەمان ئاشکرا بوو، بەشێکیش پاش شۆڕشی 1958 و ئەوجا لە سەرەتای هەفتاکاندا کاتێک گەیشتمە «کۆڕی زانیاری کورد» ساڵی 1971 دەرفەت ڕەخسا و بەشبەش کاڵای نێو هەنبانە پەخشان کران. پاشان دوای دابڕانم لە «کۆڕ» لە حوزەیرانی 1978 دا و خانەنشینیم ئەوسا ڕەخسام لە هەر بەربەستێک لە ڕێ خۆتەرخان کردن بۆ پەخشان کردنی کاڵای خۆم.

## فەلسەفەی نووسین

**وێڕای سەلماندنی فرووتەنیتان[29]، تەمام وایە چەند خاڵێکی فەلسەفەی نووسینی خۆتم بۆ ئاشکرا بکەیت.**

ژماردنی خاڵەکانی خولیای خۆم کارێکی سەختە، ئەمانە دابەشن بەسەر زۆر بواردا و لە نووسینی چەندین ساڵدا پەخشان کراون. ئەوجا گەر خۆمان دەرباز بکەین لە سەختیی ژماردن و بێینە سەر ڕێژەویان لە سەرچاوەی «دایک» ـەوە کە خولیاکانم لێی هەڵدەقوڵێن ئەوا هۆشم بە دەوری دۆزێکی مەزندا گرد دەبێتەوە ئەویش «ڕاستی»یە[30] بە پێوەری «ڕەها»ی هەمەپۆشی هەبوون. ئەمەش دۆزێکە ئازاد لە کۆتوبەندی تایبەتمەندییە دیاریکراوەکانی مرۆڤ وەک سیاسەت، ئابووری، هونەر، زانست، ستەم و داد ...هتد. فەلسەفە یان هزری بێلایەن لە ڕەهەندی سەربە زەمان و زەمینی وەهادا خۆیانی بۆ تەرخان دەکات نە سەرەتای هەیە نە کۆتا. لە نووسینیشمدا نەهاتوونەتە بەرباس مەگەر بە ئاماژەی وەها خۆلێلادانی بەربەست بێ. لەم دۆزەدا، هەتا ئەو ڕۆژەی زانستی مرۆڤ دەگاتە گەوهەری بوونی شتەکان، هەرچی کەشتی هەیە، هێشتا کەناری زەریای کاتبەدەریان[31] جێ نەهێشتووە ڕووەو شەپۆلی باڵا، ژێراو دەبن.

یەکەم وەبەردانی[32] ئەم «ڕاستی»یە مەزنە لەسەر مەیدانی «جڤاتناسی»، بە بۆچوونی من، بریتییە لە «ڕاستگۆیی». ئەمەیان

---

29- فرووتەنی: خاکەساری، تواضع.

30- ڕاستی: حقیقة.

31- کاتبەدەر: ئەزەل و ئەبەد. بڕوانە «زاراوەسازیی پێوانە»، لاپەڕە 57.

32- وەبەردان: إسقاط Projection

«دەرهەستاندن»[33] یکی تەواو گونجاوە لەگەڵ ڕاستیی بوون خۆیدا. جا گەر «ڕاستگۆیی» لە شێوەی ڕەهای خۆیدا نە ڕەنگی هەبێت، نە مەیلی بۆ شتێکی تایبەت هەبێت، نە ڕکی لێی بێتەوە، ئەوا «ڕاستگۆیی» لە چێوە جڤاکییەکەیدا بەندە بە پێوەرگەلی مرۆڤ کە دادپەروەریی پێ باشترە و ستەمکاری ڕیسوا دەکات، ڕەوایەتی، چاکە و جوانیی بە ئامانج دەگرێت. خۆ «ڕاستگۆیی جڤاکی» داهێنانێکی مرۆڤکردە و گەر مرۆڤ نەبا واتایەک پەیدا نەدەبوو بۆ «ڕاستگۆیی جڤاکی» بەو واتا بەرزانەی باس کران.

لەم ڕوانگەیەوە مرۆڤ بەناچاری دەکەوێتە بەرایی لیستی ناوزەدی ژینەوەران کە «ڕاستگۆیی جڤاکی» خۆی پێیان زەنگین بکات. کەواتە ئەو فەیلەسووفەی لە ڕوانگەی دادپەروەری و چاکەوە مرۆڤ دەکاتە هاوشانی ژینەوەرانی دیکە، بە ژیان و بە فەلەسەفەی خۆی قەرزاری ژیاری مرۆڤە. دەبا دابڕێ لە خەڵک و بچێتە ناخی ئەشکەوت و دوندی چیا و لەوێ خەریکی ئەم ئارەزووەی «یەکسانیی ڕەها»ی بێت لە نێوان گشت ژینەوەراندا لە لایەک و لە نێوان ژینەوەر و بێگیان[34] لە ڕوانگەی گەیشتن بە ڕاستگۆیی ڕەها و دادپەروەیی ڕەها لە دوا وێستگەدا.

---

33- گەر «دەرهەست»: بۆ ئابستراکت، ئەبستراکت: مجرد Abstract و «بەرهەست» بۆ بەرجەستە، ملموس Concrete وەک زاراوە جێ بگرن ئەوسا «دەرهەستاندن» بۆ «تجرید» Abstraction و «بەرهەستاندن» بۆ «تجسید» Concretization گونجاو دێن. ئەم پەیوەندییەی چەمکی «دەرهەست» و «بەرهەست» لە سایتی «ڤیکیپەدیا» ی کوردیدا لە لایەن دۆستێک بە نازناوی «ئازا» وە دانراوە.

34- بێگیان: جماد.

من ڕکم دەبێتەوە لە سەربڕینی مامر و بەرخ، لە ڕاوی کەروێشک و ئاسک، بەڵام لەم دزاندنەدا دڵخوازانە لایەنگری خەمساردیی گیانەوەرانم بە دەرەوەی خۆی و دەخەبتم بۆ گەیشتن بە ڕۆژگارێک گۆشتی دەستکرد جێی گۆشتی سەربڕاو بگرێتەوە...

ئەم واتاگەلەی لە نێو ئاگاییمدا جێگیربوون ڕەفتارەکانم ئاڕاستە دەکەن و لە نووسینەکانمدا ڕەنگیان داوەتەوە. تێیاندا داوای چاکە دەکەم بۆ هەرە زۆری ئەو خەڵکەی شایانی چاکەن. دیاریشە بەرپرسایەتیی من لە پەیامی ڕاستگۆیی و چاکەدا لە ئاست کوڕەکەم، هاوشار، خێڵ و گەلەکەم گەورەترە. گەر ئەرک و بەرپرسایەتیم بۆ خەڵکی دوورەدەست خەرج کرد ئەوا بەرپرسایەتی و ئەرک لە پەناوپاساری دونیای بێسەروبندا بزر دەبن. لە گەیاندنی پەیامی مرۆڤایەتیمدا بەم جۆرەی باسم کرد ئەوەندەم دەستپاکی بەسە کە نە ستەمی تێدا بوو لە کەس و نە دەستدرێژی.

**زمان: شێوازێکی دەرهەستەیە**

**لە بەشێک لە نووسینەکاندا، ڕاناوی بیسەر تێکەڵ بە ڕاناوی ئاخێوەر دەبن، بەوەش واتای ڕوون و ڕاستەوخۆی ئامانجی سیاسیت بز دەبێت. ئەم بۆچوونە چۆن گفتوگۆ دەکەیت؟**

چی ڕێی لێ گرتیت بە چەند نموونەیەک پرسیارەکەت ڕوون بکەیتەوە، دەیسا من لەو بابەتەی پرسیارەکەت پێشکەشی دەکات خەیاڵم بێ کاڵایە. تۆ دەزانیت ڕێنووسی عارەبی کێشەدارە بۆ خوێنەر، ئەوەتا وشەی «ذهبت» کە کاری ڕابردووی تێنەپەڕە و هیچی نەچۆتە

سەر، چوار خوێندەنەوە هەڵدەگرێت و «ت» ی کۆتای لە سێیاندا دەبێتە ڕاناوی لکاو. یەکیان بۆ ئاخێوەرە و دوویان بۆ بیسەر.[35]

ئەوجا هەڵەی چاپیش وشە هەڵدەگێڕێتەوە بۆ دژی خۆی. لەوەش بترازێت بەشێک لە ڕەوانبێژیی عارەبی بارگۆڕییە لە ڕوونیەوە بۆ نادیاری[36]. لە ئەدەبی گوتاریشدا وەها گونجاوە نووسەر بەشێک لەوەی نەخوازراوە بخاتە سەر ئاخێوەر.

زمان خۆی شێوازێکی دەرهەستە بۆ دەربڕین لە بابەتی خاوەن لەش. نووسینیش هێمایە ئاماژە دەدەن بە واتا و ئەمانیش دیسان «دەرهەستاندن»ـن و دەشێ لە تێگەیشتنیان تێکەڵی پەیدا ببێت بەتایبەتی لە شێوازی چڕدا دوور لە تێوەرێخ[37] چونکە دوور نییە بەزاندنی وردەکاریی لە واتای وشەیەکدا مەبەستی گشت دەستەواژەکە لەبار بەرێت.

دێڕی یازدەیەم، لاپەڕە 108 ی کتێبی «من هموم الحياة»[38] بە هەڵەی چاپ وشەی «المتهورين»[39] جێی وشەی «المقهورين»[40] ی گرتەوە، واتاکەی وەها شێواند هەڵگەڕایەوە بۆ دژی خۆی.

---

35- «ذهبت» - بۆ ڕوون کردنەوەی مەبەست و بۆ پێشاندانی سەر و بۆر و ژێری سەر «ت» لێرەدا دەیخەینە سەر ڕێنووسی کوردی و دەبێتە: ذەهەبتو: چووم (بۆ ئاخێوەر)، ذەهەبتی: چوویت - بۆ بیسەری مێ، ذەهەبتە: چوویت - بۆ بیسەری نێر. چوارەمیان کە ڕاناو نییە: ذەهەبەت: چوو - بۆ کەسی سێیەمی مێینە.

36- «نادیاری» لەبری «غياب» هاتووە.

37- تێوەرێخ: تحشية - بڕوانە «زاراوەسازیی پێوانە»، لاپەڕە 88.

38- «من هموم الحياة»، مسعود محمد، من مطبوعات الأمانة العامة للثقافة والشباب. بغداد، رقم الإيداع في المكتبة الوطنية 509 لسنة 1988.

دێڕی هەفتەم، لاپەڕە 39 ی کتێبی «لسان الکرد» دەستەواژەیەک هاتووە دەڵێ: «ولیست پارسیل البهلویة» لە بری «ولیست بارسیک إلا البهلویة»[41]... ئەم کار و گوتارە چۆن هاتنە گۆڕین، خودایە...

لەوانەیە بەشێک لەوەی گازەندەی دەکەیت بگەڕێتەوە بۆ بڕیارێک نموونە و دیمەنەکانی سەرەوە سەرچاوەی بن، لەوانەیشە شکەستی خامەی من بێت لە جوان تێگەیاندن، ببورە!

---

مامۆستا خۆی ئەم کتێبەی تەرجەمەی کوردی کردووە، بڕوانە: مەسعوود محەمەد، *«لە پەرۆشەکانی ژیان»*، لاپەڕە 201، چاپی یەکەم 1997 ستۆکهۆلم، وەشانی «کتێبی ئەرزان». سایتی مامۆستا: www.mamosta.net

39- «المتهورین»: کەسانی سەرەڕۆ و بێباک.

40- «المقهورین»: کەسانی شکەستخواردووی بێچارە.

41- «ولیست پارسیل البهلویة» - واتە «پارسیل پەهلەوی نییە».
«ولیست بارسیک إلا البهلویة» - واتە «پارسیک لە پەهلەوی بەولاوە چیتر نییە».

### ڕەخنەکاری لە فەرهەنگدا

## دەکرێ تابلۆیەکی ڕەخنەگرانە بۆ فەرهەنگی خۆمان دارێژیت؟ ئایە کەماسییەک هەیە لەم فەرهەنگەدا؟

فەرهەنگ خاوەن چێوەیەکی زۆر فرەوانە، کورت کردنەوەی باسەکەی لەم چەند دێڕە کەمەی بۆ وەڵامدانەوە دیاری کراون، کارێکی سەختە. پرسیاری وەها پێویستی بە خۆئامادە کردنی جیددییە تا مافی خۆی بدەمێ. لێرەدا هەم کاتی تەرخان بەرتەنگە و هەم توانا کزە، بەڵام بەگشتی دەڵێم: پێشکەوتنی هونەر بە ئاڕاستەی ئاسۆیی ڕامالێنە. بەڵام بە ئاڕاستەی ستوونی:

1. بزاوتنی گۆرانی سنووردارە بە کۆڵەواریی ئاشکرای ئاوازی عیراقی لە وێنا کردندا و پەککەوتنی لە ڕاهێنانی دەنگدا.
2. ئەکتەرمان هەن لە ڕێکارێکی زۆر شیاودا، بەڵام دەقی باش، ئازادیی هەڵبژاردن و کەشی دوور لە خۆسەپێنی کەمە... ئامێری سینەماکاریی بەردەست بەرزترن لە توانای «کاربین»ـان[42].
3. موزیک لەچاو موزیکی زووتری عیراق پێش دەکەوێت بەڵام لەچاو موزیکی میسردا دوا دەکەوێت.
4. ڕاگەیاندن بەگشتی ناگاتە ڕێکاری هاوچاوی هاوچەرخ.
5. هۆنراوە - لەوەدا کە لە بابەتی جوانکارییەوە دەچێتە چێوەی هونەرەوە - خراپ نییە بەڵام دوندی دەگمەنە، ئەو دەگمەنییە شیعری ستوونیش دەگرێتەوە. بەڵام لە ڕووی چەندایەتییەوە شیعری ئازاد زیادتر و زیادتر دەبێت. لە

---

42- «کاربین»: ڕیژیسۆر (دەرهێنەر) - مخرج Director. بڕوانە «زاراوەسازیی پێوانە»، لاپەڕە 273.

ماوەی چەندساڵێکی جەنگدا شیعری گەلێری هەڵکەوتوومان بیست بەڵام جگە لە جەنگ لێمان نەبیست.

هەرچی ئەدەبە ئەوا لە شێوەی فەرمیی خۆیدا ملکەچی سیاسەتە و دەرفەتی سنووردارە. بەگشتیش ئەدەب لای ئێمە خەسڵەتی ئەدەبی جیهانی سێیەمی پێوەیە بە دواکەوتن لە ئەدەبی جیهانی، هەم بە شێواز هەم بە نێوەڕۆک. هەتا گشت کەسێک ئازادیی دەربڕینی نەبێت لە ژیان، هیچ ئومێدێک نییە ئەدەب پێش بکەوێت.

فەرهەنگی زانستی لە ڕووی چەندایەتیی تیۆری و ڕووبەرەوە زیادی کردووە. بەڵام لایەنی هەرە گرینگی زانست لەم سەردەمەدا بریتییە لە کار، کورتهێنانی ئێمەش لێرەدا ڕوونە. ئەوەی دەچێتە مرۆڤناسییەوە خۆخاوکێنە و هەتا دێ مەودای دوورتر دەبێت لەگەڵ پشتاری[43] کاروانی زانستی پێشکەوتوو لە وەڵاتە زانراوەکانی خۆیاندا... هەڵکەوتنی چەند کەسێکی کارخاس لە بواری فەرهەنگدا ناونیشانێکی شیاو بۆ ئەو فەرهەنگە هەڵناکات.

## ئازادی و سەنسوور!

## لێیم پرسی: کاتێک گوتار دەنووسی، ئایە مژاری ئازادی خەریکت دەکات؟

بوونی سەنسوور دەکاتەوە بوونی ترس لە تیر و شیری سەنسوورکار، بەر لەوەش ترس هەیە لە بەرۆکگیریی لەسەر باوەڕ و بۆچوونی وەها سەنسوور بۆ ڕێبەستن لە زیانیان دروست کراوە. بەڵام من خۆم

---

43- پشتار: مؤخرة و پێشار: مقدمة. بڕوانە «زاراوەسازیی پێوانە»، لاپەڕە 168.

ڕاهێناوە لەسەر وێڵ کردنی نۆرەی سەنسوورکار و خۆم لە جێگەی ئەو داناوە لەوەی پەخشان دەکرێت و ناکرێت. وەها نەکەم ئارەزووم نامێنێت و خامەم دەبێتە قامیش.

کێشەی من لە دۆزی سەنسوور و لە نووسیندا بەگشتی ئەوەیە من کەوتوومەتە بەر چاودێریی ورد و پێداگری ویژدانی خۆم، لە هەر وشەیەکی دەینووسم مەرجی هەم ڕوونی و هەم ڕاستیی نیازی لەسەرە. تارمایی سەنسوورکار نایەتە خەیاڵم مەگەر وەک تارمایی ڕێگر دێتە خەیاڵی کاروانچی ناچاری سەفەر کە پەنا دەباتە بەر وریایی و لەپێناو سەلامەتیدا، ڕێ دەکات و ناوەستێ.

پێشم وایە من لە نووسیندا هۆکارەکانی وریایی و ترسم بە بابەتی دابڕ تەراز کردووە: من نیازپاکم، خوارییەک لە مەبەستمدا نییە، هێزی شاراوەش نییە دنەم بدات، زیادتر لە سێیەکی سەدەیەکە هێڵێکم گرتووە لار نەبۆتەوە. بەوەش متمانە پەیدا بووە لە پاکیی دەروونم. من لە دەفری پاکدا خۆراکێک پێشکەش دەکەم شایانی خوان بێت.

بەڵام دیسان ئەوەی لێی بەپەرێزی دێتە ڕوو. ئەوەتا سەنسوورکار چوار لاپەڕەی دابڕیوە لە گوتارە نێوەڕاستەکەی کتێبی دواییینم «من هموم الحیاة». گوتارەکە ئەم سەرەدێڕەی هەیە: «نفض غبرة عن جبين الشمس»[44] و زووتر لە میهرەجانێکی هەولێر ساڵی 1987 خوێندوومەتەوە. پاشان هەر ئەو گوتارە لە گۆڤاری «الکاتب الكردي»دا بڵاو کرایەوە، بەڵام بە چاپێکی لاواز و لەنێو چەندین بابەتی دیکە بە ڕێکخستن و پێشکەشکارییەکی نالەبار. وەهام بەباش زانی بخرێتە دووتوێی ئەم کتێبەوە بۆ ئەوەی سەرنجی خوێنەری عارەبی ڕاکێشێت. هۆکاری لابردنەکەش لە ڕاپۆرتی بابای چاودێردا نووسرابوو، هەر دەتگوت لە چلەی گەرمادا ئاوی کوڵ دەکەن

---

44- «گەردەماڵێک لە تەوێڵی خۆر».

بەسەراندا. وەی لە خەمی مێشک و دڵ، کۆرپەیان ڕادەستی دایانێک دەکرێت پاشماوەی بەسەرچووانە.

«..»

**مەسعوود محەمەد پاش ئەوەی تەواو بوو لە قسەکانی پێمی گوت: گەر دەتەوێت، بە خوێنەرانی خۆت و خۆم ڕابگەیەنە لە مشتومڕی بیروڕادا جێی بگرن، چونکە بیروڕای بێ مشتومڕ ناتوانێت نە هزرێکی مێژووساز پێک بێنێت، نە بەرپرسایەتیی هۆشیاریی جڤاکی و هۆشیاریی ژیارەکی[45] بگرێتە ئەستۆ. مەبەستی ئەوە بوو بڵێت خۆی هۆش و سنگفرەوانە بۆ وەرگرتنی وەڵام و ڕاست کردنەوەی خوێنەران، تەنانەت ئەوانەی فەلسەفەی نووسینیشی ڕەت دەکەنەوە... بگرە تێگەیشتنی خۆی لە ئازادی دەخستە بەردەستمان کە وەک بۆم سەلما تەنها یەک واتای هەیە: باوەڕهێنان بە هزری بەرانبەر، ویژدانی بەرانبەر و نووسینی بەرانبەر!**

«...»

45- ژیار: حضارة، ژیارمەند: متحضر، ژیارەکی: حضاري.

مەسعوود محەمەدی بیریار لە بیرۆکەکانیدا مشتومڕێکی زیندوو دەورووژێنن. دەتگوێزێتەوە بۆ سیستەمێک لە بیروڕا تێیدا مرۆڤێک دەدۆزیتەوە دەگەڕێ بۆ دونیایەکی نوێی ئازادی، مرۆڤێکی پاک، سازەندە و بەشدار لە هەڵبەستنی ژیاردا. جا لەبەر ئەوەی مەیدانی هزر فرەوانە و لەبەر ئەوەی بیروڕاکانی مەسعوود محەمەد لەم مەیدانەدا ڕووبەرێکی گرینگ دەگرن، هەڵسەنگاندنی دەوروبەر بۆ بیروڕاکانی، بە پێی جیاوازیی بیروڕای خاوەنەکانیان، جۆراوجۆرن، ئەویش گریمان ئەو کەسانە بابەتی هەڵسەنگاندنەکەیان تێگەیشتوون و دەرکی دەکەن. گەر نووسەرێکی بێلایەن پەیدا بێت بە ڕاشکاوی باسی لێ بکات، دەبا بڵێت: مەسعوود محەمەد کەسێکە لە داهێنانیدا ویستێکی بەهێز هەیە بۆ پەی بردن بە «بوون»، بە پێوەری خۆی بڕوای پێ بهێنێت نەک لە ڕێی لاسایی کردنەوە. نشیمەن و پەروەردەی خۆی دەستاوێژیان داوەتێ بۆ فرەواندنی ئازادیی ڕا. خەسڵەتی دەروونیی وەهای هەیە تێکەڵبوونی لە لا خۆش بکات لەسەر ڕێچکەیەکی بەلای خۆیەوە «ڕەوایەتی»یە، هەم خۆڕسک و هەم بە خۆگونجاندن ئەو ڕێچکەیەی گرتۆتە بەر وەک شێوازێکی ژیان دوور لە مەرایی و دووڕوویی. دەرفەتی هەبێت، تا ئەوپەڕی ڕادەی ڕاشکاویی، بیری جڤاکناسیی خۆی ڕاگەیاندوە. لە دیدی گەردوونپۆشیدا دەبینێت گەیشتن بە «بێخوایەتی»[46] سەختترە. لێرەشدا هەوێنی باوەڕهێنانی هەیە بەوەی مرۆڤ لە ماوەی سەدان هەزار ساڵدا دەگاتە «ڕەها» و دەبینێت گەردوون بەدەر نییە لە کارسازیی ژیرانە. مرۆڤ بە دیدی ئەم دوندی داهێنانن لەم ڕووبەرە

46- «بێخوایەتی»: إلحاد Atheism هاتوون. بڕوانە «لیستەی زاراوەکانی فەلسەفە و ژیربێژی» - «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کوردی»، ژمارە 4 ساڵی 1974 - مەسعوود محەمەد، «زاراوەسازیی پێوانە»، لاپەڕە 454.

دۆزراوەی دونیادا. مەبەستیش لە مرۆڤ نموونەیەکی «دەرهەست» نییە فەیلەسووف، بیرمەند و چاکسازان خۆیانی پێوە خەریک بکەن، بەڵکوو مرۆڤ لە بۆچوونی ئەمدا تاکێکی جڤاکییە لە هەموو مرۆڤێکدا بوونی هەیە و بۆ پەرۆشیی سیاسەت، ئابووری، هونەر، زانست و گشت باسێکی دیکە ببێتە ناوەندی بازنەی پەرۆشییان بۆ ئەوەی دەرفەت پەیدا بێت چاکە بۆ هەموو مرۆڤایەتی دابین بێت. ئائەمەیە مەزنیی باوەڕی مەسعوود محەمەد لە فەلسەفەی مرۆڤدا، بەرپرسایەتی پێش ماف دەکەوێت و سەروەریی خۆی لە ئازادیی هەڵبژاردندا چلووره دەبەستێ. ئەوجا ئەم بەرپرسایەتییەش پێبەپێی گەورەبوونی دەسەڵات مەزن دەبێت. لەم بەشەی دووەمی کۆڕەکەماندا، کە لە ماڵی خۆی بەسترا، گفتوگۆی لەتەک خوێنەردا بەردەوام دەبێت دەربارەی سیستەمی باوەڕەکانی... وەرن بە مشتومڕەوە بیروڕاکانی بخوێنینەوە...

**پێداگری!**

**مامۆستا مەسعوود، دەبینم نەوەی خوێنەران بەرهەمت دەخوێننەوە و ئاشنای سیمای نووسینەکانت دەبن. نیازت نییە پیرۆزباییان ئاڕاستە بکەیت؟**

پیرۆزبایی لە چی؟ دەبێ پیرۆزبایی لە خۆم بکەم بەبۆنەی ئەم مژدە خۆشە شادیهێنە! چاکەیان بەسەرمەوە هەیە و مافی خۆیانە من ڕاسترین زانستی خۆم لە بوارە هەمەجۆرەکانی فەرهەنگدا پێشکەش بەوان بکەم ئەویش لە چێوەی توانام لە پەخش کردن و ڕاشکاویدا.

گەر پەنا بەرمە بەر پێوەری ڕسکان - کە تەمەن پێوەری بێت - لەوانەیە بۆم هەبێ «شاهۆنراوە»ی[47] خاوێنکار بە گوێی دڵە جەوانەکانیاندا - گەر جەوان بن - بچرپێنم بۆ پیرۆزاندنی سەروەریی مرۆڤ بە خەبات بۆ گەیاندنی بە جێگەیەک بتوانێت بە ویستی ڕەهای خۆی هەبوونی مرۆڤانەی خۆی پیادە بکات. ژیانێک پیادە بکات نە زۆرداریی تێدا بێت، نە دەستدرێژی. ژیانێک گەر هیچ پەیامێکی نەبێت خاوەنەکەی ڕایگەیەنێت نێزیک دەبێتەوە لە هەبوونێکی میکانیکی، ڕۆژ و شەوی بەسەردا دێت هەر وەک بەسەر زیندەوەری دیکە و بەسەر کاڵای بێگیاندا، بێ هیچ هەڵاوێردنێک.

ژیانێک ئەو هەژەندە[48] مەرگەساتەی تێدا نەبێت کە پێی دەگوترێ پیادە کردنی «سالاری بە ستەم» لە دەستدرێژیی ملهوڕ بەرانبەر

---

47- «شاهۆنراوە»: یان «هۆنراوەی هۆنراوەکان»، «سترانی ستranان» یەکێکە لە کتێبەکانی «تەورات» («پەیمانی کۆن»). بە عیبری دەبێتە Šîr haššîrîm و بە عارەبی پێی دەڵێن «نشید الأنشاد».

48- «هەژەند»: کارەساتی گەورەی دونیاهەژێن. بڕوانە «زاراوەسازیی پێوانە»، لاپەڕە 160.

سەروەریی خەڵک. پێغەمبەر دەڵێ: «زیادەڕۆیی لە ڕووناکیدا نییە».[49] دەبا ئێمە، لەم دونیایەدا کە ستەم تێدا تاودراوە، بڵێین: «زیادەڕۆیی لە ئازادیدا نییە» چونکە باشترە بۆ سەروەریی مرۆڤ وەک شێت بە ئارەزووی خۆی بیکاتە بەزم وەک لەوەی بلەرزێ لە ترسی مۆڕەیەکی هەڕەشەکار لە گلێنەی بەدکارێکی ستەمکاری تاوانکارەوە.

## دەستاوێژێک بۆ بڵاو کردنەوەی خەبات!

### مامۆستا مەسعوود، من دەڵێم نووسەر گەر خوێنەری زۆر بوون متمانەی بەهێزتر دەبێت بە ئەزموونی خۆی. تۆ دەڵێی چی؟

ڕاستت فەرموو برا، دەم خۆش. بەڵام ئەم باسە لە دەرەوەی مەبەستی پرسیارەکەت کەمێک وردەکاریی هەیە: خەونی نووسەری ڕژد، ئەوەی چارەنووسی خەڵک بەهەند دەگرێت، ئەوەی دەیهەوێت بیان بینێت بڕوا دەهێنینن بە دروستیی ئەو چارەسەرانەی ئەم پێشکەشیان دەکات بۆ کێشەی بێچارەسەریان، هەر لە خۆوە دیارە دەکاتەوە متمانەیان بە نیازەکانی ئەم نووسەرە. بڕوا هێنان و متمانە لێرەدا دەبنە مایەی هەم شادمانیی نووسەر بە سوودی نووسینەکانی خۆی و هەم شانازیی پێیان، نەک تەنها متمانە بە ئەزموونەکەی خۆی.

ئەوجا هۆکاری تەواوی ئەم شادمانی و ئەو شانازییە بریتییە لەوەی نووسەر جگە لە خامە چ دەستاوێژێکی دیکەی نییە سەرنجی خەڵکی پێ ئاڕاستە بکات ڕووەو ئامانجێکی خۆی پێی وایە شایانی خەباتە بۆ پێکانی ئەو ئامانجە، یان بڵاو کردنەوەی لە نێو خەڵکدا یان هەرنەبێ شیرین کردنی ئەو پەیامە. بگرە لە زۆر باردا تەنها یەک پشتیوانی

---

49- «لا إسراف في النور».

دەبێت توانای لێ وەرگرێت بۆ سەرخستنی پێگەی خۆی لە نێو خەڵکدا ئەویش بیرورِا نووسراوەکانیەتی. کەواتە نووسەر یەکێکیە لەم دوو کەسە: یان هەژارێکی خاوەن «باوەڕ» تاجەگوڵینەیەکی بەسەرەوەیە لە خەرمانەی ڕووناکیی باوەڕ، ئامانجێکی مرۆڤپەروەرانە، [...] شکاندنی نارِەوایەتی.

[...] بەدەگمەن نەبێ نووسەر نییە سامانێکی وەهای هەبێت ڕۆژانە ئارەزوویەکی شیرینی پێ تێر بکات و ڕەنجی کێشابێت بەدەم سەرکەوتن و ناوداریەوە... هەتا ئێرە کێشە نییە... بەڵام هەڵسەنگاندنی گەورەتر چەسپە بە باوەڕی نووسەر بە گوتەی خۆیەوە. چەسپە بەو دڵسۆزییە قووڵەی نووسەر بۆ ئەو ئامانجەی لەسەر مەشخەڵی نووسینەکانی خۆی ڕایگرتووە. هەڵسەنگاندنی گەورەتر بریتییە لە بەردەوامبوونی نووسەر لەسەر ڕێچکەی هەڵبژاردەی خۆی بێ وەڵامدانەوە لە خەڵکەوە یان ئاوڕدانەوەیەک لە خاوەن ئاوڕەوە، ئەویش بەو مەرجەی هەڵوێستەکەی زادەی پێداگریی پاش شکەست یان شەرم لە سەلماندنی دۆڕاندن نەبێت. چونکە سەلماندنی وەها مەزنایەتییەکی ڕاستی هەیە مەگەر مەزنایەتیی ئەو نووسەرە هاوشانی بێت کە ئاپۆرە ڕادەکێشێ و پاشان هەڵەی خۆی دەبینێت لەو مژدەیەی پێی داون، دێت و بە خواستی خۆی ڕاستیی باسەکە ئاشکرا دەکات بێ ئەوەی نە قارەمانەتی بنوێنێت نە ورەبەردان لە پاشاگەردانیدا.

## عەلی ئەلوەردی

**خوێنەر هەیە، بە هۆی بوێریی بیرۆکەکانی، «عەلی ئەلوەردی»[50] بە نووسەرێکی شۆڕشگێر ناوزەد دەکات... دیدی تۆ بەرانبەر ئەو بۆچوونە چییە؟**

من واتای «شۆڕشگێڕی» بەو جۆرەی باوە لە پرسیارەکەی دوور دەخەمەوە [...]. پرسیارەکە بۆ بارودۆخی من شەکەتبوونی بەدەمەوەیە چونکە ئامادەییم نییە بۆ وەڵامدانەوەی. من زەمانێکە بەشێک لە کتێب و گوتارەکانی «دوکتۆر وەردی»م خوێندۆتەوە و ئەو دەم چاوەڕێ نەبووم ڕۆژێک بێ پرسیار لە بۆچوونم بکرێ بەرانبەر وی بۆ ئەوەی وردبمەوە، پاشەکەوت بکەم و هەڵسەنگێنم بەو مەبەستەی گوتارم لەو باسەدا هاوشانی ئەو پێگە بەرزەی بێت کە هەیەتی لە نێو نووسەرانی بیرمەنددا.

لە ئەڵقەیەکی زنجیرەی «الجذور»دا، کە بەرنامەی مامۆستا «حەمید ئەلمەتتبەعی - حمید المطبعي» بوو، بۆچوونی خۆم بەرانبەر «وەردی» پێشان دا و گوتم: ئەوەندی من بیناسم، ڕاوچییەکی لێهاتووە دەست لە مەلاسگە[51] دەکوتێ و دیدەن ڕۆشنا دەکاتەوە ئەوجا زەبری گەورە دەوەشێنێت. ئەمیش شێوازێکی وێنەسازییە بەشێک بوو لە چەندین شێواز کە لەو شەش ئەڵقەیەدا هات دەربارەی کەسایەتیی ناوداران، هەم مردوو هەم زیندوو، دەرفەتی وێنەکێشانی کەسیان

---

50- «عەلی ئەلوەردی»: علي الوردي (1995-1913) نووسەر و جڤاتناسێکی عەرەبی عیراقییە.

51- مەلاسگە: مکامن.

دەرفەتی زیادتر نەبوو لەوەی بە چەند ڕستەیەکی کورت ئادگاری[52] باسکراو کۆ بکاتەوە.

یادەوەریم لە خوێندنەوەی چەند بەشێکی کتێبەکەی: «لمحات إجتماعية...»[53] لە هۆشمدا باسێکی ڕەنگ تێکەڵ و پەرتەوازەیە لە بۆچوونی جودا دەربارەی بابەتی هەمەجۆر، وەک دەڵێن برسی تێر ناکات. ئەگەر لەم وردە یادەوەرییانە باسێک لە کەسایەتیی «وەردی» بکەم دەگەمە دەرئەنجامێک، لەچاو تەواوی کەسایەتیی خۆی، دەبێتە چەند پلەیەکی نێزیک لە پەیژەیەکی سەرکەوتووی فرەپلە.

دوکتۆر وەردی خاوەن جەماوەرێکی بەرینە هەم لە عیراقدا و هەم لە دەرەوەی عیراق. لە بواری خۆیدا خاوەن فێرگەیە. ڕاستە دەربڕینەکانی ورووژێنەر نین بەڵام نێوەڕۆکی باسەکانی خاوەن چەندین ڕەهەندن، هەژاریی چەمکی «ورووژاندن» بە «ڕۆشن کردنەوە» تێدەپەڕێنن. «وەردی» ئامادەیی بەردەوامی هەیە لە هۆشی خاوەن کەسانی خاوەن ڕادا بە هۆی جیددیبوونی پەیجۆرییەکانی کە بە شێوەی ئاسۆیی فرەوانن، بە شێوەی ستوونی خاوەن ڕیشەن، لەگەڵ زەماندا کێبەرکێ دەکەن و تەژەندی[54] بەرهەمەکانی لۆژیکی پیربوونیان شەکەت کردووە و ململانێی بارودۆخ دەکەن.

---

52- ئادگار: ملامح.

53- کتێبی «لمحات اجتماعية من تأريخ العراق الحديث» شەش بەرگ و پاشکۆیەکە لە نووسینی «علي الوردي» - تۆژینەوەیەکی جڤاتناسییە دەربارەی بەشی عەرەبستانی عیراق لە سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی عوسمانییەوە هەتا ڕمانی.

54- «تەژەند»: تێری. بڕوانە «زاراوەسازیی پێوانە»، لاپەڕە 161.

«وەردی» بە بیندریژی و سەبرکاریی خۆی، لە دوورەوە وەک سەربازێک دێتە پێش چاوم زەخیرەی زۆری هەبێت و لەگەڵ خۆی بڕیاری دابێت بگاتە ئامانجی ڕێبەست لە پشت هێڵی بەرەنگار و خەرەندی پێشار و مەتەریزی[55] هێرشی بەرانبەر... «وقل اعملوا...»[56].

## ژیریی «عەققاد»[57] و ژیریی «بیرنارد شەو»[58]

**مامۆستا مەسعوود، هەیە دەڵێن زۆریی ژمارەی خوێنەری نووسەر نیشانەی گرنگییەتی... ئایە ئەمە زانستە؟**

زۆریی خوێنەر نیشانەی گرینگییە بەڵام مەرج نییە لە گشت بارێکدا نیشانەی پێچەوانەی هەبێت. جار هەیە گرینگترین بیروڕای نووسەر نابنە هۆی سەرنجڕاکێشانی خەڵک. ئەوجا گرینگیی باسکراو لە زۆریی خوێنەردا تەنانەت گەر دەربارەی پووچترین بابەتیش بێت هەر ناپووکێتەوە. چونکە «گرینگی» بابەتێکی ڕێژەکار جۆری پەرۆشدارانی بڕیاری دەدەن: نووسینی پووچ هێندەی شکۆمەندی و شانازیی بەسە کە ژمارەیەکی زۆر لە ئاپۆرەی بێسەنگ ڕادەکێشن، خۆ هەموو بابەتێکی پووچ و کەسێکی بێسەنگ ناتوانێت جێی سەرنج بێت. ئەوجا هیچ لۆژیکێکیش لەوەدا نییە داوا لە نووسەر بکەین بێزی نەیەت ئاوڕ

---

55- مەتەریز: سەنگەر.

56- ئاماژەیە بە ڕاگواستەی: «وَقُلِ اعْمَلُوا فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ» (التوبة:105).

57- نووسەری میسریی ناودار «عەبباس مەحموود ئەلعەققاد» - «عباس محمود العقاد» (1889-1964).

58- بیرنارد شەو George Bernard Shaw (1856 -1950) بیرمەندی گەورەی ئیرلەندییە، ساڵی 1925 خەڵاتی نۆبڵی وەرگرت و ساڵی 1938 خەڵاتی ئۆسکار.

له فەرهەنگ بداتەوە کەچی چاوەڕێ بین جەماوەر ڕوو لەو فەرهەنگە بنێن.

دێتەوە یادم نووسین هەبوو دەیگوت شانۆگەرییەکی «بیرنارد شەو» نمایش کرا و شکەستی هێنا، بەڵام «بیرنارد شەو» دەیگوت شانۆگەرییەکە سەرکەوتوو بوو. دەی نێوەڕۆکی گوتەکەی لە زۆر باردا دروست هاتووە کە نووسەر بیروڕایەک ئاشکرا دەکات پێش سەردەمی خۆی کەوتووە، کەس ئاوڕی لێ ناداتەوە، پاش ماوەیەک بۆیان دەردەکەوێت چییان وێڵ کردووە. ژیرییەک بوو بەولای توانای دەرکیانەوە.

لەبیریشمان نەچێت: زۆربەی خوێنەران ڕوو دەکەنە نووسینی وەها بەلایانەوە چێژی هەبێت بەر لەوەی داوای گرینگی بکەن. ئەمە ڕاستییەکە هاوار دەکات، ئەوەتا ئەستێرەیەکی فووتبۆڵ یان سەما و گۆرانیی سەرگەرمی، لای ملیۆنان مرۆڤ، سەنگی زیادترە لە گەشاوەترین نووسەر و گرینگترین زانا، خوێنەرانیش بەشێکن لەو چەند ملیۆنە.

دەڵێن جارێک «عەققاد» بەرانبەر گفتوگۆیەکی لە تەلەڤیزیۆنی میسیردا بە دوو سەد «جونەیهـ» خەڵات کراوە، خەڵکی لێی دێنە دەنگ گۆیا بڕی پارەکە لەچاو خەڵاتی لەو بابەتە زۆرە. «عەققاد» لە وەڵامدا دەنووسێت خەڵک دوو سەد جونەیهیان بۆ «عەققاد» پێ زۆرە «ئەوەش پارەیەکە سووکترین سەماکەر بە دوو بادان پەیدای دەکات»... ئەمە قسەی خۆیەتی، خودا لێی خۆش بێت.

ئەمانە یادەوەر و پەراوێزن پرسیارەکە کێشیان دەکات، بەڵام مەبەست هەر ئەوەیە لایەنگریی نووسەر لەوەی خۆی پێی چاک و دروستە قەرزێکی ئەدەبییە لەسەری، جا ئارەزووی دڵان هەرچییەک بێت.

**وشەنامە!**

**مادام باس لە گرینگیی خوێنەر دەکەین... دەپرسم: کەی خوێنەران دەبنە جەماوەر... ئەرێ ئەم دوو چەمکە جیاوازییان هەیە؟**

جیاوازیی نێوانیان لە ڕووی زمانەوانییەوە ئاشکرایە: وشەی «قراء / خوێنەران» هەر بینە سێ[59] کەس دروستە. هەرچی جەماوەرە کۆمەڵێک خەڵک دەگرێتەوە، بە دید و مەزەندە نایەنە ژمار. هەتا ئێستاش نەم زانیوە بۆچوونێک جیاوازیی کردبێت لە نێوان «فلان خوێنەری هەیە» و «فلان جەماوەری هەیە» بەڵام وەهای تێدەگەم «جەماوەر» بە دوو خاڵ لە «خوێنەر» جودا دەبێتەوە: یەکەمیان زۆریی ژمارەیەتی و دووەمیان جۆرە پەیوەستبوونێکە بە نووسەرەوە. وشەی «خوێنەران» مەرج نییە نە زۆری بگەیەنێت نە پەیوەستبوون بە نووسەر یان بابەتێکی تایبەتەوە. بەڵام زۆریی ژمارە لە وشەی «جەماوەر»دا ئاشکرایە و جەمبوونی جەماوەر نیازی کۆبوونەوەی تێدایە کەواتە «جەماوەر» واتای لایەنگریی جڤینی تێدایە.

بەڵام گرینگیی نێوەڕۆک لەم وشە یان لەویان بە کردەوە و لە داکەوتدا نایەتە دی هەر لەبەر ئەوەی وشەکە واتایەکی گرینگی هەیە. چونکە ئەگەر جەماوەری خوێنەرانی نووسەر، بیرمەند یان فەیلەسووف خاوەن هەڵوێستێکی لایەنگرانەی دلێر نەبن، ناوزەد کردنیان بە «جەماوەر» هیچ گرینگییەکی نییە.

سەرەتای لاپەڕەی 127 ی کتێبی «من هموم الحیاة» لەم بابەتەدا ئەم دەستەواژەیەم نووسیوە:

---

59- لە عارەبیدا تاک، دوان و کۆ هەیە - وشەی «قراء» کۆیە، بۆ سێ و سەرووترە.

*«چی فەلسەفەی عارد و فەلسەفەی ئاسمانیش هەیە پەککەوتە دەبێت ئەگەر خەڵکێکی بەدواوە نەبێ بە نیازی لەکارهێنانی، ئیمانی پێ هێنابێ. چاکەش بابەتێکی ناسکە زوو دەبەتڵێ و بارمتەی بەهێزی گەرەکە...»* [60]

ئەمەم گوتوە، مەبەستیشم بووە و پێداگریشم کردوە لەسەر چەسپاندنی لە مێشکاندا، ئا لێرەشدا و لە گشت زەمان و زەمینێکدا جەختی لەسەر دەکەمەوە.

جەماوەر گەر چەپڵەی بۆ بیرۆکەیەک کوتا و بە ڕەفتار پێچەوانەی نواند، فەرمانی سزادان بۆ خۆی دەر دەکات. جەماوەر گەر پەست بوو لە ڕەفتاری نووسەرێکی لایەنگر چونکە ڕەفتارەکە لە ئاست ئەو لایەنگیرییەدا نییە بەڵام ئەو جەماوەرە بەدڵی خۆی لە نێوەڕۆکی ئەو لایەنگیرییە لا بدات - ئەوە دەبێتە مایەی کوشتنی دادپەروەری و سەرڕاستی.

نووسەر نە پێغەمبەرە نە فریشتە، نە ئەستێرەیە نە وەلی. نووسەر وەک هەموان مرۆڤە، مل بۆ فەرمانی ناچاری کەچ دەکات، لە ئاسوودەیی دەگەڕێت، لە بەدکارییەکانی زەمان و زەمین دەترسێت. نووسەر گەر بزانێت ئاشکرا کردنی لایەنگریی خۆی تووشی بەرەنگاربوونەوەی دەکات لەگەڵ مەترسی و بێباکیدا، وێڵ کردنی ئەو بەرەنگاربوونەوەیە لەئەستۆ دەگرێت، ئەوسا جەماوەری خوێنەرانیشی لەتەک ئەودا دەبنە لایەنگری ئەوەی نووسەر باوەڕی پێیەتی و ئاشکرای کردووە.

---

60- بڕوانە مەسعوود محەمەد، *«لە پەرۆشەکانی ژیان»*، لاپەڕە 47، چاپی یەکەم 1997 ستۆکهۆلم، وەشانی «کتێبی ئەرزان». سایتی مامۆستا: www.mamosta.net

جەماوەریش گەر لایەنی باوەڕێک بگرن و بە ڕەفتار لێی لادەن، وەک نووسەران بەرپرسن. بەڵام جیاوازیی بەرپرسایەتییەکە لەوەدایە ڕیسوابوونی نووسەر وەک ڕیسوابوونی ئەکتەرە لەسەر تەختی شانۆ، چاوی بینەرانی لەسەرە، ورد و درشتی هەڵەکانی لێ دەکەنە بار. بەڵام جەماوەری بینەر و هاندەر بۆ نمایشە جوانەکەی ئەکتەر، بە تاریکی و پەنهانی پارێزراون. دوور نییە یەک لەوان چەپڵە لێدات بۆ پەردەیەکی ڕۆڵبازی[61] تێیدا باس لە ڕەوشتبەرزی بکرێت، هاوکات دەست درێژ بکات و نوقورچێک لە نەرمەی خانمە جوانەکەی هاوسێی بگرێت.

لێرەدا زیادەڕۆییەکی هەلپەرستی هەیە، لە تەرازووی «ڕەوایەتی»ی ڕەهادا، پاشگەردانیی بەدەمەوەیە. ڕاستە بە ڕووکەش زیانی بۆ هەلپەرستەکە خۆی نییە بەڵام دڵنیابە لەوەی برەوسەندنی دەبێتە مایەی زیانێکی گشتی لە گرینگترین بواری گوزەرانی گشتیدا، چونکە بەدەم چێژوەرگرتنی گشتییەوە لە شیرنایی «هەلپەرستی لە ساتی تاوانکارییەکەدا» هەم ئازادی لەناو دەچێت هەم سەروەری.

**کێشەی ناسنامە؟**

**خوێنەران دەربارەی تۆ بۆچوونی جیاوازیان هەیە، بەشێکیان تۆ بە ئەدیب دەزانن، بەشێکی دیکەیان، سەرتەڵان، دابڕانە دەڵێن تۆ بیرمەندیت. ڕاستیی خۆتمان پێ بڵێ؟**

وەک دەبینیت من دەنووسم! دیارە بیرمەندمیشم چونکە بیر دەکەمەوە بەڵام بیر کردنەوەم دابڕاو نییە لە داکەوت، من سەرکەوتەی بۆشایی نیم. نەهاتووم ژمێرکاریی لەسەر ساختەکاریی زۆرلەخۆکردوو هەڵبەستم، گۆیا ناچاری داوای دەکات... من لایەنگری ئەوە نیم کە

61- ڕۆڵبازی: تمثیل.

دەڵێت «بیر دەکەمەوە کەواتە هەم» چونکە گوتەیەکە خۆی لە ملیۆنان بابەت لا دەدات کە دیارە هەن و خۆی هەڵدەواسێت بە تاکە یەک کاریگەریی کۆئەندامی دەمار لای مرۆڤ. دەبا بیگوتایە بیر بەشێکە بۆ متمانە کردن بە بڕیارەکانی چونکە زادەی ئامرازگەلێکی هۆشمەندن، سەلمێنراوە کە دەتوانن ببنە منداڵدانی هزر. دیسان چونکە ئەو بڕیارانە لە دەرەوەی هزریش، بە بەڵگەنامەی ئامرازی زانستی - کە دروستییان سەلمێنراوە - سەلمێنراون.

هزر گەر ئەمڕۆیش لە باسێکدا کورتی بهێنێت توانای هەیە سبەی لێی دەرباز بێت، زاڵبوونی بەسەر شکەستەکانی ڕابردوودا ئەم بۆچوونەم دەسەلمێنن. بەڵگەیەکی دیکەش ئەوەیە توانای ئاشکرای هەیە بۆ دۆزینەوەی ڕێبازی دڵنیابوون. بەڵام گومان کردن لە «هەبوونی گەردوون لە دەرەوەی هزر» گەر گومان بێت - تەنها گومان - لە «هەبوونی ماددی»دا ئەوا هەر لە یەکەم چرکەدا دەکاتەوە کوشتنی بیر چونکە دەبێتەوە هەڵواسینی هەبوونی بیر - کە لاوازترین پلەی دامەزرانی هەیە (چونکە بە خەو، بە لێوانێک مەی، بە دەرزییەک مۆرفین، بە شێتبوون و مەرگ لەناو دەچێت)- بە گەردوونێکی ماددیەوە کە هەبوونی بەرگومانە. گوتاریش لێرەدا دەربارەی هزر کوڵە و داشبڕاوە لە دیڤچوون و پووچەڵ کردنەوەی ئەو بەڵگەیانەی گومان ڕەپێش دەخەن. گوتار لێرەدا تەنها لە ڕێگەی بەڵگەکارییەوە هاتووە باسی هزری دەرهەست دەکات. گەرچی پرسیارەکە مەبەستێکی دیکەی هەیە بەڵام وەڵام بەناچاری هەردوو باس دەگرێتەوە.

ئەوجا هزر بۆ خۆی بابەتێکی تۆژینەوەیە لە وردەکاریی یەکجار زۆرەوە، چەندین ڕشتەی زانستی ئەزموونەکی، چ ڕاستەوخۆ چ تیان[62] کاری لەسەر دەکەن. بیرمەندیش، بۆ ئەوەی شارەزایی هەبێت دەربارەی

62- تیان: ناڕاستەوخۆ.

بەهێزترین دەستاوێژی خۆی لە کاروباریدا، پێویستی بە تۆژینەوەی وەها هەیە. لەوانەیشە لەبەر زیادە لەخۆ ڕادیتن بێت، کە خەسڵەتێکی باشیش نییە، کاتێک دێتە سەر خۆبەدەستەوەدان بۆ بیروڕای زێدە سەیروسەمەرەی زانایان دەربارەی فیزیا، ماتەماتیک، بیری ڕەها، دۆزی جێی مشتومڕ لە نێوان فەلسەفە و زانستی ڕەهادا، من سەختۆڵم.[63] کاتێک بیرۆکەی «زەمانی گەڕاوە بۆ دواوە» ڕووبەڕووم دەبێتەوە من دوودڵ دەمێنم لە سەلماندنی بنەمای ئەو وێنایەی پێشنیازی وەهای لێ زاوە. گەرچی هەر خۆم پتر لە دە ساڵ زووتر - ئەو دەمە ئاگاداریم لەم بابەتە نەبوو - لە بۆنەیەکی ئەو دەمە خۆی سەپاند، نووسیومە: «جا ئێمە لە بوونماندا گەر وەک بەردێک گلۆر بینەوە لە ڕابردووەوە بۆ ئایەندە یان هەڵدەقولێین لە داهاتووەوە وەک ئەو بەنەی ڕادەکێشرێت و گرمۆڵە دەکرێت وەک تۆپ...» هەتا کۆتای گوتار. خۆ شیمانەی «زەمانی گەڕاوە» لە وێنای ڕەهای مندا بۆ شیمانەکان نامۆ نەبوو بەڵام مەیلم زیادترە بۆ زانستی ڕاستگۆی ئەزموو.[64] دەزانم لە دە ملیۆن بەشی شەپۆلی تیشک ئێمە دەرک تەنها بە یەک بەشی دەکەین وەلێ دیسان مەزنیی نەزانراو نابێتە بەڵگەی هەڵەبوونی کەمی زانراو، بەڵام دەبێت ڕووبەرێکی هەمیشەیی تەرخان بکەین بۆ شیمانەی دیکە.

ئائەمەیە من پەیڕەوی دەکەم و زۆر دەرئەنجامی لەسەر هەڵدەبەستم بۆ نموونە مافی کەس زەوت نەکەم لەبەر جیاوازیی بیروڕامان، چونکە دوور نییە بۆچوونی ئەو دروست بێت، دەبا ئەویش بە بۆچوونی خۆی شاناز بێت بەو مەرجەی ئەویش ڕێز لە بۆچوونی کەسانی دیکە

---

63- سەختۆڵ: «متعنت»، «مستبد برأیە». بڕوانە «زاراوەسازیی پێوانە»، لاپەڕە 215.

64- «ئەزموو»: تەجرەبەکراو - مجرب. «نەزموو» پێچەوانەکەیەتی.

بگرێت مادام لە دەستدرێژیی بەدەرن. دەرفەتی درێژە پێدانی دیکە نابێتەوە.

بێینە سەر ئەدەبنووسیم: گەر ئەدەب پیشەوەری تاکە یەک ڕشتە بێت ئەوا لای من پەیدا نییە. من گەر ڕشتەیەکیش بگرمە بەر پەرۆشیم بۆ ڕشتەی دیکە هاوشانی ئەمیان دەبێت چونکە من نەمتوانیوە هزرم دەربکێشم لە ڕشتەکانی دیکەی زانیار بۆ ئەوەی خۆم تەرخان بکەم بۆ گشتەباسی ئەدەب. بنەمای ئەو دیاردەیەش بریتییە لەو دیدە هەمەپۆشەی هەمە بۆ هەبوون: نەترازانی بەشێک لە بەشێکی دیکە. تەنانەت سەرگەردانم بەدەست ئەو کێشەیەی پێی دەگوترا «قرب الشعري الشمسي». ماوەی پتر لە دە ساڵ پرسیارم لە گشت کەسێک کردووە لێم ڕادیتبێ لێی بزانێت، لە کۆتادا زۆرم لەگەڵ مامۆستا «کامل الدباغ» و دوکتۆر «حمید مجول» گوت... هەتا بەدەم خوێندنەوەی گشتیمەوە، لە کتێبی «داستانی ژیار»[65] دا باسەکەم بۆ ڕوون بۆوە. لەوێدا بە ناوی «شروق الشعري الشمسي» هاتووە و لە پەراوێزدا دوکتۆر «زكي نجيب محمود» ڕوونی کردۆتەوە.

لە بابەتی ئەدەبیدا نووسینم هەیە، دەربارەی ژیانی شاعیرانم نووسیوە، بەشێک لە گرێ هەرە سەختەکانی شیعری کوردیم شرۆڤە کردووە، لە زۆر بواری پەیوەندیدار بە ئەدەبی پەتییەوە بۆچوونی خۆم ڕوون کردۆتەوە. دەیسا دوور نییە ئەدیبم و ئاگام لە خۆم نەبێ.

---

65 - *The Story of Civilization*, Durant, Will & Ariel.

**بیسەران...!**

**جارێکیش پێمت گوت، گوتارم ڕووی لە هۆشی گەورەیە. مەبەست ئەوەیە تۆ بۆ سەرتەڵ دەنووسیت؟**

فرە جار گوتومە و هەر جارێکیش پێوسیت بووبێت دووپاتم کردۆتەوە: ئەرێ، من بۆ سەرتەڵ (نوخبە، ئێلیت) بگرە بۆ بژاردەی سەرتەڵان دەنووسم. بەڵام ئەوەندە نووسین من ڕوون ناکەنەوە بەڵکوو دەمخەنە بەر تیشکێکی وێڵکارەوە چونکە من لەهیچە ئەم شێوازی گوتار و جۆری «بیسەر» هەڵدەبژێرم. ئەم بژارەیە زادەی سروشتی بڕوامە بە گرینگیی هەڵبژاردنی ئەو شێوازانەی باشتر ڕێک دێن لەگەڵ مەیلەکانی خۆمدا و بەروبوومیان نێزیکتر دێت لەگەڵ نووسینەکانمدا ئەویش لە سنووری توانا - ئەگەر شتێک هەبێ بەری هەبێت بەدەر لەو هۆکارانەی دەبنە هاوکاری بەر گرتن.

من گەیشتوومەتە ئەو بڕوایەی تاوانی هەرە گەورەیە بۆ کەسێکی وەک من هەوڵ بدات خوێنەری ساکار بورووژێنێت سواری کەشتییەک بن مەترسیی تێدا بێت بۆ گیان و بەرژەوەندییان و پاشان گەر تووشی گێچەڵ بوون، بۆ هاریکارییان لە گشت کەس بێتواناتربم.

مەبەستم نەبووە خەڵک لە خۆم کۆ بکەمەوە بۆ سازدانی حیزب و سازمان، تەنگژەی پێ ببڕم و لە پێناودا قوربانییەکان بەکەم بگرم. چ بەرژەوەندییەک دابین دەبێت گەر ڕەنجی ڕێکخستنی سازمانێک بدەم ژمارەی سازمانەکانی دونیا بە یەک دانە زیاد بکات؟ بەگشتی خەڵک ناخوێننەوە، بشخوێننەوە تێناگەن، زۆربەی خوێنەران دابەشن بەسەر باوەڕگەلێکدا لە هۆشیاندا چەسپیوە. لە ناچارییە دەمودووی من ڕووی لە خەڵکی دەستبژێرە، بەو هیوایەی لانیکەم تاکوتەرایان بڕوا بە دروستیی بۆچوونەکەم بهێنن، جاروبار پەیڕەوی بکەن، بەوەش

ڕێبازێکی شیاوم گرتبێتە بەر بۆ گەیشتن بە ئامانجی گەیاندنی چاکە بە ئاپۆرەی بێدەسەڵات.

ئەوجا گەر ڕووی دا چەند خوێنەرێکی سەربە ئایدیۆلۆژییە جێگیرەکان لە گوتاری من تێگەیشتن و باوەڕیان هێنا، یان خوێنەرانێک لە دەرەوەی ئایدیۆلۆژییەکان بوونە لایەنگر چونکە ڕایان لە بۆچوونەکانمە، ئەوا خێری سەربارە، جێی دەهێڵم بۆ ڕێچکەی ڕووداو لە دەرەوەی بازنەی چاوەنۆڕیم.

من لایەنگری پەیامێکم، گەر کۆسپی گەورە نەمێنن، توانایەک لە خۆمدا دەبینم بۆ پیادە کردنی و لەبەر ڕۆشناییدا ڕاستگۆیانە ڕێ دەکەم. گەر شکەستیشم هێنا ئەوا هەر خۆم دەبمە تاکە زیانکەوتە، ئەویش بە پێوەری خەڵک بۆ سوود و زیان، نەک بە پێوەری خۆم، چونکە من نەدەچووم ڕێگەیەکی دیکە بگرم بمگەیەنێتە تێروتەژیی ئەم دونیایە. ئەوپەڕی چاوەنۆڕی لە منەوە دانیشتنە لەسەر خۆڵێکی یەک مەتر دووجای ئەم دونیایە، بێ نووسین و بێ پەژارە.

## ڕەخنەگران دوور دەکەونەوە!

## لە نێو کەسانی خاوەن ویژداندا هەیە دەپرسێ: ڕەخنەگران بۆ لێت بەپەرێزن؟

ئەوانەی نەیاریی بەرانبەرم دەنوێنن زۆریان نووسی، لە نووسینیش تێپەڕین بەرەو تۆمەت هەڵبەستن و«شکات». بەشێکیان هێندە سووکایەتییان نواند وێنەیەکی وەها ڕووتی خۆیان پێشان دا مایەی شەرمەزارییە. مەخابن! لەگەڵ ئەوەشدا لای من نەبوونە جێی سەرنج، چونکە مشتومڕی من دەربارەی ڕێباز و باوەڕە ئەویش بەپێی وزە و توانام. هەر بۆ دادپەروەریش دەڵێم ئەوەندەی من بزانم لە نێو ئەوانەدا

تاکە یەک عارەبی تێدا نەبوو… سوودێکیش نییە لە ڕیز کردنی ئەو ناوانەی بۆ دڵڕاگری دەربارەی منیان نووسیەوە چونکە هەم ژمارەیان کەمە و هەم بۆ پێکانی مەبەستی پرسیارەکەت، بڕ ناکەن.

هۆکاری کەمیی نووسین لە مەیدانی کوردیدا دەربارەی من، وێرای زۆریی نووسینم بە کوردی و پەسەندبوونیان لە لایەن جەماوەرێکی بەرینەوە، دەگەڕێتەوە بۆ بار و هۆکاری تایبەت بۆ چینەکاری ناشێن. لەوانەیە بەس بێت ئاماژە بدەم بەوەی دەست گرتنی نەیاری بۆچوونەکانم بە جۆرێکی دیار یان شاراوە بەسەر دەستاوێژی پەخشان کردندا کاریگەریی ئاشکرای هەیە. لاوانم دیتووە لە نەوەی نوێ گازەندەیانە لە وێڵ کردن و ڕەت کردنەوەی بەرهەمەکانیان بەهۆی نەگونجانیان لەگەڵ بیروڕای سەرپەرشتیارانی ئەو لیژنەگەلەی تایبەتن بەو کارانە. کتێبم هەبوو بە لاپەڕەی 31 دێڕی و پیتی بچووک چاپ کراوە، هاوکات کتێبێکی دیکەی بەختەوەریش بە لاپەڕەی 20 دێڕی و پیتی گەورە. بەو کارە ئەندازەی کتێبەکەی من نێو هێندەی کتێبەکەی دیکە دەرچوو.

هۆکاری دیکە هەیە بۆ نموونە: نووسینەکانی من باس لە بابەتی وەها دەکەن لە مەیدانی کوردیدا بەرتەکی جیاواز پەیدا دەکەن، ئەوەش خوێنەر دەکشێنێتەوە لە دەربڕینی دەستخۆشی لە نووسینەکە نەکا پەلکێشی بەرەنگاریی بێت لەگەڵ نەیارانی بیروڕاکانم.

هەرچی خوێنەری عارەبیمە ئەوا هەتا ئەم کاتەش لە چینی ڕۆشنبیر و ڕێکاری مامۆستای زانکۆن، ئەویش کەمژمار. ئەوانیش لەوانەیە خەریکی کاروباری گرینگتر بن یان بۆ دڵڕاگرتن بەرەنگارم نابنەوە یان لە پەیڕەوەی کردنی ڕێبازم بەپەرێزن…

«…»

**کاتێک تۆمارەوەرم ڕاگرت لە تۆمار کردنی بیروڕایەکانی، منیش وەک ئەو کەوتمە پرسیار: ئایە بۆچوونەکانی شتێک لە مێشکی خەڵکدا دروست دەکەن؟ چاومان داخست... کەوتینە خەونەوە... شیاربووینەوە[66] و مەسعوود محەمەد لەبەر خۆیەوە دەیگوت: «من ڕامگەیاند...» هەر دەتگوت پەیامی بیرمەندانە بە خوێنەران ڕادەگەیەنێت!**

«...»

66- «شیار»: بۆ هوشیارە، کەسی بەئاگا، پێچەوانەی خەوتووی بێگائا.

**بەشی سێیەم**

**لەم بەشە و لە بەشەکانی دیکەی «کۆڕی مشتومڕی بیروڕا» دا، نووسینەکانی مەسعوود محەمەد بەدەم بەسەر کردنەوەی بابەت و داکەوتی ئەم ژیانەی کە لە نێزیکەوە لێی ورد دەبێتەوە و لایەنە نایەتییەکانی دەبینێت، خرۆشانی هەناوی پێشان دەدەن. هەر خۆڕسک داوای نووسینێک دەکات بانگەشەی چاکسازی دەکات. بۆ نموونە ئەو گەر ببینێت کەسانێک هەن لە بانێکی بەرزەوە تۆپانێ دەکەن، وەک گولله دوای تۆپ دەکەون و شیمانەی بەربوونەوەیان بەرەو مەرگ ئاشکرایە، ناچێت خۆی بە ئەستێرە، ئاسک و شەیدابوونی چەپکەگوڵەوە خەریک بکات. ئارەزووشی بکات هەر ناتوانێت، چونکە سەرلەبەری هۆشی گیرۆدەی هەنگاوی ڕاکردووەکانە، لەوانەیشە پەژارە وەها بەرۆکی بگرێت بگاتە ڕادەیەک پەی بردنی بەو مەرگەساتە بگۆڕیت بە سڕبوونێکی تەماوی، لە ڕێی دزە کردنی جۆرێک لە وڕبوونی دەرک، خوتخوتەی دەمارەکانی بدات و بگاتە خەونی شیاریی. لەگەڵ دۆزی چارەبەدەر کوا چارە، سروشتی مرۆڤ فەرمانی خۆی هەیە، لێوانگەلیش لە تاڵاو لێواولێون، تینوەتی سووتێنەرە، «فەلتیشۆک»[67] نەخواتەوە چی بکات و کوا ڕێگەی شەوێک لە شەوانی کلیوپاترا؟[68]**

**مەسعوود محەمەد لە مشتومڕی بیروڕاشدا هەر وەهایە... وەرن بیروڕاکانی لەم مشتومڕەدا بخوێنینەوە.**

---

67- فەلتیشۆک: حنظل *Citrullus colocynthis* ڕووەکێکی ژەهراوییە.

68- کلیۆپاترا (Cleopatra VII Philopator (69 BC-30 BC دوا فارۆن (فیرعەون) ی دەوڵەتی پەتۆلێماسی Ptolemaic dynasty ی میسری دێرین بوو.

**مامۆستا مەسعوود، سەرەتا گوتت کتێبەکانت برەویان لە نێو سەرتەڵاندا پەیدا کردووە. ئایە پێت خۆشە لە دەرەوەی عیراقیش ناو دەرکەیت و کتێبەکانت چاپ بکرێن؟**

پرسیارەکە خەریکە وەڵامی خۆی دەداتەوە... گەر «ئایە»ی پێشار[69]ی پرسیارەکە بگۆڕیت بە «تۆ» دروست دەردەچێت. کێیە ناوداربوونی نووسینەکانی خۆی پێ خۆش نەبێت؟ ئەدی نووسینم بە ئومێدی بڵاوبوونەوە نەبووە؟ بۆ لە نووسینەکانم چ هیوایەکی دیکەم هەیە جگە لەوەی خەڵک بیخوێننەوە و بیسەلەمێنن بەڵکوو سوودبەخش بن... لای من خوێنەری ساکار بۆ خۆی ئامانج نییە گرینگی و هێزی پێ پەیدا بکەم، سەرتەڵی دەستبژێر لەم بوارەدا ئامانجن چونکە ئومێدم گەیاندنی چاکەیە بە خەڵک لە ڕێی ڕێز گرتنی ئەمان لە بیروڕام.

بەڵام لە بازاڕی ڕۆشنبیریدا کۆی خوێنەران باسێکی سەنگینە. پێشوازیشیان لە نووسەر بەڵگەیەکی زیندووە بۆ گرینگی و سوودی نووسینەکانی، دۆخی ڕیزپەڕی لێ دەرچێت کە نووسین ڕیزپەڕ و نامۆیە یان دەمودووی لەگەڵ ڕەمەکە. ئەوجا ناوداریی لە دەرەوەی سنوور لە واتادا ڕۆشنبیرانی هەمەجۆر دەگرێتە خۆی. ڕێکەوتێکی سەیریشە وەڵامم بۆ ئەم پرسیارە دەکەوێتە ڕۆژی 07-12-1988 و هەر ئەو ڕۆژە زەنگی تەلەفۆن لە وەڵاتێکی ڕۆژاوای ئەورووپاوە دێت و داوای کتێبەکانم دەکەن... دەیسا چۆن بتوانم بۆ دابین کردنی داواکارییان چەندین نموونە لە نووسینەکانم بنێرم؟ خۆ گەر لەوێ یان لە جێیەکی دیکە چاپ بکرێنەوە سوودی هەمەلایەنەی لێ دەکەوێتەوە.

---

69- «پێشار»: لای پێشەوەی فلانە بابەت - «مقدمة». بڕوانە «زاراوەسازیی پێوانە»، لاپەڕە 168.

ئەم باسە دیویکی دیکەشی هەیە: من بە بیروڕایەکانی خۆم نازۆم، پێشم خۆشە بە ناسینیان لای ئەورووپایی بەهای فەرهەنگییان بکەوێتە هەڵسەنگاندنەوە، لەوانەیە لای ئەو جێی سەرنج بن، یان پێویستیان بە دەستکاری بێت، یان ڕەت بکرێنەوە. گەر بابای ئەورووپایی ئەم گوتەیەم بخوێنێتەوە کە لە کتێبی «وجهة نظر في التفسير البشري للتأريخ»[70] دا هاتووە و دەڵێ:

«إن هذا القلم الذي أكتب به هو من ناحية إرتباط وجوده بإرادة الإنسان بشري أكثر من الأصابع التي تمسكه...»

«ئەم خامەیەی پێی دەنووسم لە ڕووی پەیوەستی هەبوونییەوە بە ویستی مرۆڤ پتر مرۆڤکارە وەک لەو پەنجانەی خامەکەیان گرتووە...»

دەبێ، لە ڕوانگەی «مرۆڤەکیبوون» و «ماددیبوون» ی کەرەستەی دەستکردەوە، چی تێدا بڵێ؟

ئەدی بەرانبەر ئەو گوتەیەم چی دەڵێ کە لەم دوا کتێبەمدا «إلى العظيم غورباتشوف» هاتووە و دەڵێم: «مەتریالیزمی مێژووکرد» لە ڕاستیدا لە «ماسوولکایەتیی مێژووکرد» زیاتر چی دیکە نییە.[71]

---

70- مسعود محمد، «وجهة نظر في التفسير البشري للتأريخ». بغداد 1985. حەکیم کاکەوەیس ئەم کتێبەی تەرجەمەی کوردی کردووە، بڕوانە بەشی کتێب: «سەرنجێک لە سەر لێکدانەوەی مرۆیی مێژوو»، سایتی مامۆستا: www.mamosta.net.

71- «مەتریالیزمی مێژووکرد»: «المادية التأريخية». «ماسوولکایەتیی مێژووکرد»: «العضلية التأريخية».

**هۆنراوە و هزر**

**بچینە لای بابەتێکی دیکە، لای هۆنراوە، مامۆستا مەسعوود لەوەی هۆنراوە بەشێک بێت لە هزر، «موحییەدین ئیسماعیل / محي الدين إسماعيل» ی بیرمەند دەڵێ: «گشت هۆنراوەیەکی مەزن هزرێکی مەزنی لە پشتە»، چۆن لەم گوتەیە دەڕوانیت؟**

لاریم لەم گوتەیە نییە ئەوجا سەرنجێکی لاوەکیشم هەیە، هۆنراوە بریتییە لە تێکەڵەیەکی بەشێک یان گشت ئەم پێکهاتانە: جوانی، سۆز، ئامانج، مۆزیک وەک جوانییەکی جودا لە ڕەهای جوانیی، ڕاستگۆیی هەست و بابەتی دیکەش دەچنە پاڵیان. مەرجی «ژێهاتن» و «بەهرە»شم وەکنار خست چونکە ئەوانە بەشێکن لە «هۆنراوەی مەزن» و ناوهێنانیان پێویست نییە. کەواتە دەکرێت لەبەر تیشکی ڕاگواستەی پرسیارەکەوە لەم دوو گۆشەیەوە بڕوانینە هۆنراوە:

1- گۆشەی گێڕانەوەی هۆنراوەکە بۆ ئەو زەمانەی تێیدا هۆنراوەتەوە بۆ زانینی ڕادەی «مەزنایەتی»ی هۆنراوەکە، ئایە چەند مەزنایەتیی هونەریی - بەپێوەری ئەو زەمانەی خۆی - تێدایە؟ «شیعری جاهیلی»[72] بە هەر پێوەرێکی گوتاری زەمانی «جاهیلی» بیهەوێت، مەزنە، هەڵبەت هزر یەکێک نەبووە لە مەرجەکانی.

2- گۆشەی جۆری ئەو گوتارەی بە هۆنراوە داڕێژراوە: لەوانەیە دایکێکی جەرگسووتاو هۆنراوەیەک بلاوێنێتەوە کزە لە جەرگ هەڵستێنێ. هەیشە لە جوانی، ڕاستگۆیی و خۆڕسکیدا دەگەنە

---

72- چەمکی «جاهیلی» - بەعارەبی: «جاهلي» - واتە «سەربە زەمانی نەزانین» ئاماژەیە بۆ ئەدەب و گوزەرانی عارەبی بەر لە ئیسلام. «شیعری جاهیلی» - «شعر الجاهلي» وەک چەمک بۆ هۆنراوەی عارەبیی بەر لە ئیسلام جێی خۆی گرتووە.

نموونەی باڵا، بێ پاڕانەوەی هزر دەبنە «سانای نازۆ»،[73] «میخائیل نەعیمە»[74] لە «گەڵای پاییز / أوراق الخريف»دا دەڵێ:

| | |
|---|---|
| *تناثري تناثري* | *يابهجة النظر* |
| *يامرقص الشمس ويا* | *ارجوحة القمر* |
| *گەڵارێزانە ڕێزانە* | *ئەی شادیی دیدە* |
| *ئەی سەماگەی خۆر و* | *دیلانێی مانگ* |

«بیری مەزن» ناچێتە چێوەی «هۆنراوەی مەزن»ـەوە مەگەر لای کەسانی بلیمەت کە توانان سەختی سەختەڵان دەستاژۆ بکەن. جا گەر تیرەیەک لە هۆنراوەی مەزنی هەمەبابەت گرد بوونەوە، بێگومان ئەوەی خاوەن «هزری مەزنە»، دەبێتە هەرە مەزن.

**گڕکەوتنەوەی سۆز..**

**لە دووتوێی شۆخییەکی دۆستانەدا گوتم مامۆستا مەسعوود... لە هزری تۆدا کانییەک لە سرووش، خەیاڵبازی و موزیک هەیە، ئەدی بۆ هۆنراوە نانووسیت... فەرمووی:**

من لە تەمەنی هۆنراوەدانان تێپەڕیوم و گەر زۆری لێ بکەم دەبێتە شتێکی وەک «ئەلفییەکەی ئیبنوو مالیک».[75] پێم وایە توانای من لە

---

73- «سانای نازۆ» بۆ «السهل الممتنع» هاتووە.

74- «میخائیل نعیمة» (1889-1988) بیرمەند و نووسەری ناوداری لوبنانی.

75- «محمد بن عبد الله بن مالک» (c. 1204-1274) ناسراو بە «ابن مالک» نووسەرێکی ناوداره لە بواری زماناسی و ڕێزماناسی عارەبیدا، ناودارترین بەرهەمی کتێبێکە بە ناوی «ئەلفییەی ئیبنوو مالیک» / «ألفية ابن مالک» تێیدا ڕێزمانی عارەبیی بە شیعر نووسیوەتەوە.

گونجاندن، ئارایشکاری، نەخشاندن، شیرازەکاری و بابەتی لەو چەشنە بۆ دارِشتنی پەخشان خۆشجڵەوترە، تێکەڵ دەبێ بە شیعری ئازاد گەر هەست بە شیعراندن بکەم، بەڵام لێی دوورم لەبەر هۆکاری دابڕ، یەکەمیان: ئەوەی لای من گڕی سۆز هەڵدەگیرسێنێت دوورم دەخاتەوە لە خەریکبوونی هزریم و فەرمانەکانی. کاتێک گڕکانم هەڵچێت و لافاوم سەر بکات شووره و پەرژینگەلی نێوان خۆم و ڕابردووی خەوندیدەم دەڕمێن [...] و لە ڕێی پاییزێکی کورتکراوەوە بەهار هەڵدەمژم، بەری گەیووم بێ گوڵ کردن لە خونچەی وشکهەڵاتووەوە، دەوەرن. ئایە ئەمەت پێ باشە؟

هۆکاری دووەم: ئەو دیمەنە هەڵگەڕاوە سەیرەی منە کە دێتە پێش چاوی دۆست و خوێنەر... بینیومە پیاوی تەمەندار پۆشاکی هەرزەکارانە دەپۆشن و لەتەک زارۆکاندا سواری چەرخوفەلەک دەبن، دیمەنیان خەفەتهێنە... لەوانەیە هەبێت بڵێ خۆ دەکرێ مرۆڤ بە ناوێکی خوازەوەوە[76] خۆی پەردەپۆش بکات، دەڵێم دەشێ پەردەپۆش کردن بەشێکی زیانەکان بەربەست بکات نەک گشتی، چونکە ئاوێزانم لەتەک دونیای ویژدانی شیعریدا - جا بەسەر کردنەوەی هەستێک بێت لە تەمەنی لاویدا ئاگر و پریشکی دابێت، یان بەسەر کردنەوەی کۆنە گڕکانێکی زادەی خەیاڵ بێت بە شلەی ئاگرین تینوەتی خۆی بشکێنێ - گشت توانای بەخشینم بە ئاڕاستەیەکی توند ڕووەو «ویژدانی سۆزەکی» پاوان دەکات، کەچی من لە مەیدانی دیکەدا داواکاریی پێداگرانەم لەسەرە. ئەوجا هەڵکشانیشم بۆ ئاستی بەرز لە بواری شیعردا هەم باسێکی بەرگومانە، هەم خەڵکیش بێمنەتن لە مێوانێکی نوێ بۆ دیوانە سیخناخەکان بە شاعیری زۆروزەوەند.

---

76- «خوازەوە»: خوازرایەوە، «مستعار». بڕوانە «زاراوەسازیی پێوانە»، لاپەڕە 109.

**شیعری هەرە نایاب کەمن!**

**هەستم کردووە شیعر دەخوێنیتەوە و لە گەشە کردن و شێوازەکانی دەگەڕێیت. لەم سەردەمەدا شیعری کام لە شاعیران دەخوێنیتەوە؟**

لە ڕاستی لانادەم و ڕاستگۆیانە دەڵێم بەگشتی ئەو هونەرانەی جوانکاری دەبێتە بنەمایان، ڕامناگرن مەگەر شێوازیان لە پلەی ئاسایی هەڵکشێت. من گوێ لە موزیکی نایاب دەگرم نەک لەبەر ئەوەی ئەڤینبازی لەگەڵ خۆراک یان بانگەواز بۆ دێمۆکراسی دەکات. پەیکەر و نیگار، بە نایابیی ئەو هونەرەی تێیدا خویا دەبێت، تەنانەت گەر دژ بە باوەڕی خۆیشم بێنە گۆ - کە نایەنە گۆ - بەندم دەکەن. نێوەڕۆکی هونەری بابەتێکە دەبێت تێکبەستەی شێوازی هونەری بووبێت دەنا ئامۆژگارێک بێنن چیمان بەلاوە پەسەندە پێمانی بڵێن و دوژمنانیشمان نەفرەتباران بکەن.

شیعریش وەک هونەرەکانی دیکە لە ڕێی جوانکاریی دیار و ئامادەوە دەچێتە بابەتی هونەرەوە. لەم ڕووەشەوە بەرتاوی ئەو مەرجانەیە کە لەسەر هونەر هەیە، ئەوجا خەوشی شیعر دیارتریشە چونکە هەیەتی: کێش و قافیە [شیعری ستوونی]، تەفعیلە و موزیک، گوتە و هاوئاهەنگی، وێنا و خەیاڵ... هتد و زۆرێکیش لەم ڕیشاڵانە بەشێک نین لە پێکهاتەی هونەرەکانی دیکە، کەواتە هۆکاری کەماسیی لە شیعردا زۆرترن کە دەبێ هوشیاریان بین.

لەبەر ئەوە و لەبەر هۆکاری دیکەش شیعر کاتێک دەبێتە شیعری نایاب هەم داهێنانی زۆری لەگەڵدا بێت و هەم دووریش بێت لە خەوشی بەرشیمانە[77]ی زۆر. پێم خۆش نییە کە دەڵێم شیعری نایاب

77- بەرشیمانە: محتمل.

بوونی کەمە، ئەو بارە سەنگینەی لە کۆڵیەتی لە بەرپرسایەتیی «گوتار»ەوە دێت، واتە نێوەڕۆک، ئەویش باسێکی ڕوونە ئەو لێڵییەی تێدا نییە کە لە هێڵی نیگارکێشی و زەنگی عووددا هەیە. گوتەی خزی فێڵاوی و فریودەری بێشەرم جوانیی شێواز و داڕشتن دەکوژێت...

دەبا ڕەوا بێت دەرکی هونەریمان دەرباز بێت لە شاگریێ «نێوەڕۆکی ڕوون»ی شیعر بۆ ئەوەی لە بەرپرسایەتیدا هاوشان بێت لەگەڵ پەیکەرتاشی و هونەری دیکە بەڵام ئەوە ڕوو نادات چونکە ئەم ڕەخنەیە لە نێو دەرکی ئێمەدا لاڵ نابێت مەگەر نایابیی شیعرەکە لە شێوازی داڕشتنی هونەریدا گەیشتبێتە پلەی توانابەدەر و پاساو بۆ نێوەڕۆکی کرچوکاڵ بێنێتەوە. بەم ئاڕاستەیە بۆ ڕیشەدۆزیی شیعری کۆن و نوێ، ستوونی و ئازاد قسەم زۆرە وەها بە ئاسانی لێی ناگەمە کۆتا، بۆیە هەم خۆم و هەم خوێنەر لێ دەبوورم و لە خێری سنوورداری ئەم ڕۆژنامەیەی بڵاویشی دەکاتەوە، دەبوورم. لە کۆتادا بە داوای لێبوردن لە شاعیران و زۆربەشیان دۆستمن بەڵکوو بمبەخش، دەستبەرداری ئەم باسە دەبم.

## گەڕان بەدوای بنجی دەردەکەدا

**دەبینم لێرەدا دەگەڕێیت بەدوای ئەرکی جڤاکیی «داهێنان»ـدا، ئەمیش دروستە بەڵام مامۆستا مەسعوود: کامە شاعیر و کامە نووسەر بۆ ئەم جڤاتەی ئێمە دەست دەدەن؟**

جڤاتی ئێمە پێویستی بە گشت جۆرەکانی نووسەر و شاعیران هەیە بە مەرجێک نەگاتە ڕیسوایی، ئێمە پێویستمان بە نووسین و شیعری ڕیسوا نییە... پێویستمان بە هەمەجۆربوون هەیە تەنانەت لە لاسایی کردنەوەدا لەگەڵ سەرنج دانە جیاوازیی پلەی پێویستی لە بابەتێکەوە بۆ بابەتێک، لە زەمانێکەوە بۆ زەمانێک، لە دۆخێکەوە بۆ دۆخێک...

بەڵام ئەم پێویستییە بەتەنها بەس نییە بۆ پۆلێن کردنی شاعیران و نووسەران بەگوێرەی پێویستیمان بۆیان، چونکە هۆکاری دابڕ بۆ دەرخستنی دروستیی ئەم شاعیر و ئەو ئەدیبە بریتییە لە دابینبوونی کەشی گونجاو بۆ دەرخستنی نهێنیی دەروون ئەوەش تەنها بە بوونی ئازادیی دەربڕین. نەبوونی ئازادی دەکاتەوە ڕاستگەڕانی گوتە ئابوورییە ناودارەکەی دەڵێت: «دراوی خراپ دراوی باش ترۆ دەکات».

کەواتە گەر بکرێت پێوەری «دروستیی بەپێی بارودۆخ» وێڵ بکەین و گوتار ئازاد بکەین، ئەوسا گومان نامێنێت لەوەی هزر - جا لە نووسیندا بێت یان شیعر - جێی پێویستییە چونکە لە پەناوپەسێوی بوونی جڤاکیدا دەگەڕێت بۆ بنجی کەماسیی، گەندەڵی و چەوتی. ئەوجا گەر هزر لە ئەرکی پێشەنگیی خۆی دابڕا و بووە فەرمانبەری پاشکۆیی، دەبێتە دوورترین بابەت خەڵک پێویستی پێی بێت، چونکە ژیان بە هەر جۆرێک بێت گوزەرانی خۆی دەکات [...] با ئەو هزرەش نەبێت کە مزەی پاشکۆیەتیی خۆی وەردەگرێت. بگرە واتای ژیان بێ هزرێکی [... ملکەچی...] نارەوایەتی، چەوتیی کەمترە چونکە هۆکاری گومڕایی تێدا کەمترە. گشت جیهانی سێیەمی بەرینی دەردەدار پێویستی هەیە بە نووسین، بە شیعر و بە گوتار - بەگشتی - بنجی دەردەکان پێشان بدەن، بەڵکوو ببێتە هۆکارێک بۆ پەیجۆریی چارەسەر...

**هەلپەرستیی زانستانە!**

**باشە گەر تۆ یەکێک بیت لە تۆژەرانی ئەرکی جڤاکیی «داهێنان»، بۆچوونت چی دەبێت بەرانبەر گوتەی: «هەلپەرستیی لە داهێناندا پردێکی زێڕینە بەرەو نەمان»؟**

بریا سەرچاوەی ئەو گوتەیەم زانیبا، چونکە دابڕینی لە سەرچاوەکەی خۆی شیمانەیەک هەڵدەگرێت و دژەکەشی. گەر واتای هەرە ئاشکرا و هەرە ترسناکی لێ بار بکەین کە دەکاتەوە: کەسی سەروەر (نووسەر بێت یان ئەدیب، زانا یان هونەرمەند، سیاسەتمەدار یان دیندۆست ...هتد) سەروەریی خۆی بە نرخی هەلپەرستی لەدەست بدات ئەوا گوتەکە بە پێوەری ڕاستیی ڕەها، تا ئەوپەڕی سنووری ڕاستی، دروستە. لەدەست دانی سەروەری وەک چاوی بینایە و بیانیی لەدەست بدات، هەردووکیان هەن بەڵام بێ ناوەڕۆک.

بەڵام «پردی زێڕین» لە کێشانەی داکەوتدا باسەکەی تایبەت و دوورە لە «ڕەهاندن» و «دەرهەستاندن» چونکە ئاپۆرەی خەڵک لە ژیانی ڕۆژانەدا کە پڕە لە کێشەی گوزەران، دابین کردنی ئاسوودەیی و خۆ چەپارەدان لە مەترسی، سەودایان لەگەڵ ئەو ڕاستینە ڕەقەیە کە بەرتاوی چەندین هۆکارە یەک لەوان ئەم «پردی زێڕین»ـەیە لە چەند مەیداندا. مرۆڤێک بیهەوێ کوڕەکەی خۆی لە زیندانی ستەمکارێک ڕزگار بکات نە «دەرهەستاندن»ی نازێڕین فریای دەکەون و نە ئەو کتێبانەی گاڵتەیان بە زیندانی ستەمکار دێت دەردی دەرمان دەکەن. ئاخر ئەم مرۆڤە نە خۆڕسک ئامادەیە و نە جڤات بە توانای ڕاهێنەرانەی چاکخوازانەیەوە ئامادەی کردووە تا ببێتە مۆم بۆ ڕۆشنایی خەڵکی دیکە.

ئەدی ئەوانەی دیکە بۆ نابنە مۆم؟ دەی ئەگەر هەلپەرستیی زێڕین سەرمافە بۆ سەرتەڵان بە کامە لۆژیکی دادپەروەرانە داوا لە

سەوزەفرۆش و جلشۆر بکەین خۆی بەرز ڕاگرێت لێیان، نە گەداییان لێ بکات، نە دڵیان ڕاگرێت و نە خۆی لە بەڵایان چەپارە بدات؟ ئەوا دەبینین نەوەی بەرتیلخۆران لە نەریتی بەرتیلدا و لە گشت بوارانداٍ ڕێزدارن. دەشبینین نەوەی کەسانی نابوودی پاکژی لەبەر نابوودیی خاوێنیان لە گشت بواراندا وێڵ کراون.

دوورە... دوور... ئەو ڕۆژەی ئەو پردانە تێیدا دەڕمێن.

**مرۆڤ لە گوتارەکانمدا بابەتی «دەرهەستاندن» نین!**

**مامۆستا مەسعوود، تکایە پێم بڵێ: ئایە لە گوتارەکانی خۆتدا نیگەران دەبیت... کەی...؟**

ئەو کەسەی لە پەرۆشیی منی هەبێت نووسینەکانی بەدەر نابن لە کەمئارامی، با بڵێم نائارامی. ئایە مارباز هەیە لەگەڵ ماری داندار و زەنگۆڵەداردا نیگەران نەبێ؟ ئەم نیگەرانییە لە بەرەژانی هزر بە نێوەڕۆکی گوتارەوە سەرچاوە دەگرێت، ئەمیش بەگشتی و بەزۆری نێوەڕۆکێکە پەیوەست بە مرۆڤی دەردەدار و کۆستکەوتووی بێ هۆکار.

مرۆڤ لە گوتارەکانی مندا «دەرهەستاندن» یێک نییە دابڕێنراو لە گشت وردەکارییەکانی خۆی بەڵکوو ئەو مرۆڤەیە کە تووشی دەبم، تاکە، تەرایە پەیوەستە بە دونیاوە، کوردە، عارەبە، عیراقییە و سەربە جیهانیی سێیەمە بەگشتی. بەدەگمەن نەبێ ئاوڕ لە مرۆڤی ئاسوودەی جڤاتە پێشکەوتووەکان نادەمەوە مەگەر پێویستیی بەراوردکاری، یان دۆزینەوەی نموونە بۆ پێشاندانی شیمانەی گەش یان ڕەت کردنەوەی گوتەی فریودەر، بیمەرجێنێت.

چۆن دەتوانم دوور لە نشیمەنی خۆم بژیم و لە نیگەرانی بەدەربم؟ 23 ساڵ و 5 مانگ و 24 ڕۆژە هەتا ئەم ساتەی شەوی سێشەم، شەشی

کانوونی یەکەم، ساڵی 1988 ناچاری ڕیشەکێشی کردم لە نیشتیمانی خۆم و هەڵی داشتم بۆ خاکێک هیچ ڕەگێکم تێیدا نییە مەگەر وەڵاتیبوون، لێوەی سۆزم سەر دەکات بۆ ئەو پێدەشت و دەربەندەی منداڵیمی لە ئامێز گرت و جەوانیمی لاواندەوە، بەڵام هیچم پێ نابڕێت جگە لە پەلە نیگای ڕێبوارێک بە هەڵکەوت ڕێ تێ دەکەوێت.

ئەوجا گەر ئەم دۆخەی من بە ئاسوودە دانرا لەچاو دۆخی ملیۆنان ملیۆنی ملیۆنان سەرگەردانی ئەم جیهانی سێیەمە ئیفلیجە، گەر پێشەنگەکانی، ڕێبەرەکانی و سەرۆکەکانی، بە ئارەزووی شێتانە و هەڵەوپەڵەی خۆیان، لە نەهامەتیی ئەو خەڵکە بێنەوایە زیادە بکەن، گەر پەژارە و پەستی خۆیان و جیهانەکەیانی وەها داپۆشیبێت دەرفەت نەدا بە یەک تاکە خاڵی ڕووناک، دەبێ ئەو نیگەرانییە نەفرەتییە کامە بێت بەرۆکی گوتارەکەم نەگرێت؟ یان چاوەڕێیت خامەی لە ژەهر هەڵکێشراوم دادۆشم هەنگوین و ئاوی سازگاری لێ بچۆڕێت!

**پارێزەرانی ئازادی!**

**مامۆستا مەسعوود لەم هاوردوبردەدا دەڵێم: گەر نووسەران پێداگریی بکەن لەسەر دۆزی ئازادی نیشانەیە بۆ ئەوەی ترسیان هەیە. ئەم گوتەیە تا چ ڕادەیەک دروستە؟**

منیش ڕێک پێچەوانەکەی دەڵێم. تۆ بەو گوتەیە مەنارەکەت ئاوەژوو کردەوە بۆ ناخی زەوی و بووە بیر. گەر بانگەشەی ئازادی ترس بێت ئەدی چ دلێرییەکی شاراوە خۆی مات داوە لە بێدەنگی یان لە پەسنی ستەم و خەفە کردنی گیاندا؟ ئادەی پێم بڵێ کامەیە بەهای بەرزی مرۆڤایەتی کە نووسەر دەتوانێ بانگەشەی بۆ بکات و بەرزتر بێت لە بەهای ئازادی؟ چییە ئەو زیانەی هەڕەشەی لەدەستدانی لەسەر بێت؟

«محەمەد ڕەزا شا پەهلەوی» سامانی بۆ سەدان هەزار ئێرانی دابین کرد بەڵام وەها سەروەریی لێ داماڵین «ساواک» دەیتوانی گوێی هەرە مەزنەکەیان بگرێت و لە خۆڵدا بیگەوزێنێت. نووسەر گەر دەنگی ویژدانی خۆی کپ کرد دەتوانێ ئاڕاستەی خامەی خۆی بە جووڵەیەکی پەهلەوانی 180 پلە بگۆڕێت ڕووەو ئاڕاستەیەکی پێچەوانە. لەو کارەشدا نووسەر چ پێویستی بە قارەمانەتی و دڕدانی مەترسیی نییە بەڵام دەرهاویشتەکەی ئەو کارە چ سوودی بۆ کۆمەڵگە نییە چونکە بەدەرە لە دەنگێکی هەڵاوێردە،[78] دەنگێک بوونی هەڵە، کەماسی و خزین ئاشکرا بکات.

قسەکانی تۆ گەورەم ئامانج دەپێکن گەر مەبەست پەرۆشیی نووسەران بێت بۆ چارەنووسی خەڵک لەوەی زەوت کردنی ئازادی هانیان دەدا بەرگریی و پێداگریی لێ بکەن، ئەمیش کرۆکی باسەکەیە بێ فریودان و لێکدانەوە. پارێزەرانی ئازادی، کەسانێکی دڵسۆز و ڕاستگۆن، لە مەیدانێکی ئاواڵەدا بێ پاراستنی چەکی ڕێبەست، دلێری لە سازگاریی ویژدان، پاکیی ئامانج و دیدەڕوونی لە بەهادا، دەگرن.

**ڕێبازی ئازادی لای من!**

**لە نووسین و کتێبەکانتدا چۆن ڕەفتار لەگەڵ چەمکی ئازادی دەکەیت؟**

من بیرم لە ئامادە کردنی وەڵام نەکردۆتەوە بۆ پرسیاری لەم جۆرە. ئازادی لە نووسینی مندا نێوەڕۆکێکی مەزنە لە نێوەڕۆکەکانی جڤات و پەیوەستە بە سەروەریی مرۆڤەوە. ئەو سەرشارانەی خۆیان دەخنە بەر نیگا و باوەڕمەوە زادەی چەرمەسەریی گوزەران، بەرهەمی هزر،

78- هەڵاوێردە: متمیز.

ئەزموونی میللەتان و لۆژیکێکە چاکە لە خراپە جودا دەکاتەوە.
یەکەم تۆویش لەم تۆوڕێژییە شین بێت ئەوەیە کە ئازادی پتر مافی تاکە وەک لەوەی دەستدرێژی، زۆرداری و زەوت کردنی ئازادی مافی دەسەڵاتسەپێن بێت. گەر بەدکار ماف بە خۆی بدات من کۆتوبەند بکات مافی خۆمە بەسەر خۆمەوە ئەو کۆتوبەندە بشکێنم.

ئەدی بۆچی ئەم ئاشکراییە ساکار و بەڵگەنەویستەی جووتە لایەنی ستەم و خواستی سەروەری لە جیهانی سێیەم شین نابێت، بەڵکە وەک لێمان دیارە پێچەوانەی ئەو چاوەنۆڕییە بەرهەم دێت؟ ئەم باسە داستانێکی هەیە باس کردنی درێژە دەکێشێت. چەند لایەنێکی ئەم داستانەم لە لاپەڕەی 140 بەولاوەی کتێبی «من هموم الحياة» - دەرچووی سەرەتای ئەم ساڵە 1988- ڕوون کردۆتەوە. لە نووسینی دیکەشدا کاروباری ڕێبوارانەم هەبووە لەگەڵ دیاردەی هاسانیی ستەم و هاسانیی ملکەچی. کەمێک بە ڕوونی ئەو باسە لە دووتوێی کتێبی «وجهة نظر في التفسير البشري للتأريخ» - دەرچووی 1985- دەبینیت.

نووسەر، لەو وەڵاتانەی ئازادییان تێدا کەمە یان هەر نییە، لە نووسیندا ڕوو لە هەر کوێیەک بکات و لە هەر کوێ بگیرسێتەوە، ئازادیی وەک دۆز تووش دەبێت. لەبەر ئەوەی کزیی ئازادی خۆی تەرجەمە دەکات بۆ بەهێزیی دەسەڵاتدار. ئەمیش هێزی خۆی لە گەمەی وشەی یەکتربڕ و شەترەنجدا خەرج ناکات، ئەم هێزی خۆی دەخاتە گەڕ بۆ گرد کردنەوەی خۆشەمەنیی دونیا ئەویش لە ڕێی زەوت کردن و داگیر کردنیان لە ئاپۆرەی خەڵک و لەوانەیشە بکوژێ، بڕووخێنێ، بسووتێنێ و تاوانان بچەرخێنێ. دەیسا دۆز، چارەنووس، سەروەری، میللەت، ئاسوودەیی، ژیار و هەر واتایەکی دیکەی بەرز، خۆ دزینەوە لە جندۆکەی ئازادی، چۆنە؟

ئەم بەڵگەنەویستە دەمخاتە سەرسوڕمان لە بۆچوونی نووسەرانێک بانگەشە بکەن بۆ هەر جۆرێکی دیکتاتۆری کەچی گشت سەرمایەی ژیانیان بریتییە لە ئازادیی نووسین. چەند سەیرە ڕۆژێک بێت بۆ نموونە پەز بانگەشەی ئازاد کردنی گۆشتخۆری یان ڕێبەستنی گیاخۆری بکات! هەرچی دووپێیە نابێتە مرۆڤ!

**خواستگەلی سووتێنەری چاکەخواز!**

**ئەدی مامۆستا مەسعوود چ خواستێکی هەیە ئاشکرات نەکردبێت؟**

مەبەستت کام جۆرە لە خواست، گشتی یان تایبەت بە کاروباری فەرهەنگی و سیاسەت؟

پێم وانییە کەس هەبێت لە سینەیدا وردە خواستی گیرخواردووی نەبێت، ئەو خواستانەش لەگەڵ فرەوانبوونی ئاسۆی دیدگەی مرۆڤ بۆ دونیا، مەیلی زیادبوونیان هەیە، خۆ نەزانراو نابێتە مایەی خواست. ئەوجا گەر بابەتی «خواست» لە بەستێنی «ڕەها» دەر بکەین و لە چێوە خولیاکانی نووسەردا سنووربەستی بکەین ڕێم دەبێت بڵێم خواستم ئەوە بوو لە «گەشتی ژیانم»دا وردەکار و بێ تەنگەتاوی بیرەوەرییەکانم بگێڕمەوە.

ئەوەی لە گۆڤاری «ڕۆشنبیری نوێ»دا - بە کوردی دەردەچوو - لێیانم بڵاو کردەوە و لە ئاڵقەکانی زنجیرەی «الجذور»دا باسیان هات و پاشان لە دووتوێ کتێبدا کەوتە بەردەستی خەڵک، بەشێک بوو لە گشتەیەک، ئەوەی ما ڕێی پەخشانی نەبوو لەبەر ناسازیی بارودۆخی ئەم وەڵاتەی کەوتۆتە ژێر بارگرانیی دەمبەستن و ڕێبەستن.

دەستفرەوانی لە ئاشکرا کردنی وردەکاریی ژیان دەبێ دادپەروەرانە بێت، بەشێک لەو ڕێبەستانە ئەدەبی و ئاکارەکین چونکە زۆر لە

پەیوەندییەکانی تاک بەندن بە کەسانی دیکەوە نابێت نهێنییان ئاشکرا بکرێن و سڕینەوەی چیرۆکەکانیان لە جووتسەری پەیوەندییەکە بەشەکەی دیکە بێ واتا دەهێڵێتەوە. خواستی تایبەتیش هەیە پەیوەندیی نییە بە کەسی دیکەوە بەڵام بۆ بڵاو کردنەوە دەست نادەن لەبەر بەزەیی بەخۆدا هاتنەوە یان ڕێز گرتن لە هەستی خەڵک، بابەتەکەیان بۆ بڵاو کردنەوە نەشیاوە.

بەڵام هۆی پەژارەی ڕاستینە بریتییە لە ڕێبەستنی چەندین خواستی چاکەخواز [...] و بەشی هەرە تاڵ لەمەدا ئەوەیە ڕێ دان بە بڵاو کردنەوەیان ماوەیەکی هێندە درێژ دەخایەنێ سوودی پێوە نامێنێ و ئەوسا دیسان ڕێبەست و ڕێگر لە خواستی نوێ پەیدا دەبن بۆ ڕەخنە گرتن لە مژاری هەراسانکار دێنە مەیدانەوە.

دڵم دەڵێت خواستێکی بەهێز لای زۆر کەس هەبوو ئامۆژگاری بدەن بۆ ڕێگرتن لە سەرچڵییەکەی مایسی 1941 ی لای خۆمان و حوزەیرانی 1967 ی میسر، بەڵام ئایە بارودۆخ ئەو بەیان کردنەی پێ کێش دەکرا؟ هەتا ئەمڕۆش دەرفەت ساز نەبووە بۆ باس کردنی مژاری لەم بابەتانە بەو ڕاستگۆییەی پێویستە. هەوڵیشم داوە لە ژیاندا باز بەسەر ئەو ئاستەنگیانەدا بدەم کە ڕێ لە ئاپۆری خەڵک دەگرن بۆ ڕا دەربڕین. بەو کارەش کەسانێکم تووڕە کردووە. بەڵام پەشیمان نیم، تواناشم هەبێت لە بارودۆخی هاوشێوەدا هەڵوێستی هاوجۆر دەنوێنم. گەر ئەوەشم بۆ بلوێت ئەوا کەمێک دڵدانەوەی تێدایە لە ڕێبەستنی بەیان کردنی خواستگەلی سووتێنەری چاکەخواز.

«...»

**کاتێک گەیشتینە ئەم تەوەرە هۆشی کەوتە قوڵپ دان. گوێم بۆ هۆشی ڕاگرت، نیشتیمانپەروەری لێ هەڵدەقوڵێ. نیشتیمانێکی بەرین و باڵا، بە خێرایی ویژدان پەلکێشی دەبیت. ئەم نیشتیمانەی کەسانی وەک مەسعوود محەمەدی تێدایە هەر دەبێ نیشتیمانێک بێت ژینگەفرەوان، ڕا، زمان و دیدەگەش. داستانی ژیاری ئەم عیراقە بە دەستی کەسانی بلیمەت چنراوە کە زادەی هزر و مێژوون. ئەم وەڵاتە هەر دەبێت هزری ڕەسەن و هۆشی مەزن و دیدەی وەها بەرهەم بێنێت هەم دووری بەرز و هەم ئاسۆی دوورتر لە مەودا ببینێت. جا بۆ ئەوەی بلیمەتەکانمان بپارێزین دەبێ گوێ ڕادێرین بۆ زایەڵەی هەنگاوەکانیان و بەچاوێک سەیریان بکەین کە سێچارەکیان ئاوێزانی خوداوەندە و یەکچارەکیان بریتییە لە تێکەڵەی داکەوت و لە بزاڤی بەرچاو...**

«...»

بەشی چوارەم

ئەدی دەربارەی ئەم فەرهەنگە عیراقییەی ئەم سەردەمە، دەبێ مەسعوود محەمەد چ بڵێت؟ دەستی ڕاستی بەرز دەکاتەوە و بەو جیددیبوونەی لێی ناسراوە دەڵێ: بەشێکی ئەم فەرهەنگە بەرزە، بەشێکی بەرخوازە، بەشێکی نەخوازە و بەشێکی ڕادەبەدەر دزێوە. ئەوجا گەر بکرێت وشەکانی لێک بدەینەوە، دەڵێین: لەم فەرهەنگەدا ئەو بەشەی مەراییە بۆ نەرمەژینی فرەوان، ئەوا دەبێتە لەکە بە ویژدانی خاوەنیەوە و ژەهری کوشندە لە گەدەی جەماوەردا. ئەو بەشەی پەراوێزکەوتەیە دەبێتە بڵق و لە ماوەیەکی کورتمەودادا دەتەقێ و «هیچ»ی لێ دەزێ. ئەمما ئەوەی مامناوەندە، مەسعوود لێی دەگەڕێ نەکا دابەزێت، مەگەر بابەتێکی نوێی پێ بێت، لە هەر بوارێکدا، با نوکتەیەکیش بێت پێشتر نەبیسترا‌و.

مەسعوود محەمەد لەبەر ئەوەی بیرمەندێکی لایەنگرە بۆ ویژدانی مرۆڤایەتی، داوا دەکات «ڕەوایەتی» هەبێت لە هەموو نووسینێکدا. گشت وشەیەکی ڕەوا دلێرانە و دڵسۆزانە بەیان بکرێت دەبێتە نقێم و خشڵی فەرهەنگ و ژیار دەنەخشێنێت. لەوەش بترازێت دەبێتە دیاریی وەفاداری و دڵسۆزی بۆ نیشتیمان. بەولای ڕەوایەتی تەنها گومڕایی دەمێنێت.

لەم دوابەشەی کۆڕەکەماندا مەسعوود محەمەد واتای ڕەوایەتیی ڕەوابوون - لە هەر جۆرێکی فەرهەنگدا بێت - ڕوون دەکاتەوە.

## تەنگژە... تەنگژەی جۆرایەتی

**مامۆستا مەسعوود، نووسەر هەن دەڵێن ئێمە لە داهێناندا تووشی تەنگژە هاتووین. تۆ ئەم تەنگەژەیە لە چیدا دەبینیت؟**

دەڵێم تەنگژەی ئێمە گشت ڕێکارەکانی گرتۆتەوە، کێڵگە و کارگەی زیادتر گرتۆتەوە وەک لە شیعر و ئەدەب. لەبەر دەرگەی دیوانی بەرپرسی فەرمی تەنگژەکان کەڵەکە دەبن، کاتێک مرۆڤ کاری تێیان دەکەوێت ململانێی نێو ئەدەب و هونەری لەبیر نامێنێت. ماسیفرۆش و ئاگردەری «مەسگووف» پێویستییەکانی تەنگژەدانی کڕیار لەخۆی گرد دەکاتەوە، سەوزەفرۆش، بۆریکێش، گەوهەرفرۆش و ستەمکاریش هەر وەها دەکات.

ئادەی کامەیە ئەو شوێنەی سەر سینەی وەڵاتەکەمان تەنگژەبەدەر بێت؟ نەکەی گومانی ڕەشبینیم لێ بکەیت، هێزی دیدەی هۆشم 6/6 و لە سایەی ئەم هێزەوەیە لە نێو پەردەپۆش کردنی ڕاستییەکاندا سەرشۆڕی دەبینم.

لە مەیدانی داهێنان و ئەدەبدا - کە شیعریش دەگرێتەوە - بەگشتی تەنگژەیەک نییە وەک ئەوەی بە تەنگژە دادەنرێت لە نەبوونی گۆشت، بزربوونی تەماتە، سەختیی گواستنەوە و گەڕان. پێشم وەها نییە پێویستمان بە بڕێکی زیادتر شیعر و پەخشان هەبێت، چ تەنگژەیەک لە «چەندایەتی»دا نییە. بەڵام تۆیش و منیش دەتوانین باس لە تەنگژەی «جۆرایەتی» - «چۆنایتی» بکەین: بەر لە هەموانیش تەنگژەی «نێوەڕۆک»ـە. نێوەڕۆک بۆ نموونە هەتا دەرفەتی خۆدەربڕین[79] بۆ نەوەیەکی سەرلەبەر دابین نەکرێت ناتوانێت خەسڵەتی جیهانیبوون پەیدا بکات. جار هەیە ئازادیی لە وەڵاتێکدا

79- «خۆدەربڕین»: «تعبير عن الذات».

پێویستی بە سەد ساڵە هەتا یەک دوو بلیمەت و هەڵکەوتە پەروەردە دەکات.

لێمان دیارە کە خەسڵەتی بەرچاوی بڵاوکراوەکان بەگشتی ڕەنگگرتنە بە شێوازی فەرمی. لێرەدا مەیل یان خواستنی کەسی بڕیاردەر لەسەر شایەستبوون و نەبوونی نووسراو کاریگەری هەیە لەسەر برەو پەیدا کردنی نێوەڕۆک و بابەت. بەوەش دەرفەتی نووسەر لە هەڵبژاردنی ئەو باسە خۆی پێی وایە ڕێگەی جیهانیبوون پەیدا دەکات، تەنگ دەبێتەوە. چونکە «جیهانیبوون» ملکەچی فەرمانبەری عیراقی و پێوەرەکانی وی نییە بۆ بڕیاردانی چاکە و گەندە.

لە ڕاستیشدا دۆزی ئازادیی پەخشان کردن یەکێکە لە کێشەکانی ئەو وەڵاتانەی شۆڕشیان تێدا هەڵگیرساوە و باشترین نموونەش ڕووسیا سۆڤیەتە. ئەوەتا هەڵکەوتنی یەک بلیمەت هاوشانی ئەدیبە ڕووسە کۆنەکان بێت، لە نێو نەوەی پاش شۆڕشی بەلشەڤیدا، دەگمەنە. ئەگەر کەسێکیش بە پێوەرە جیهانییەکان هەڵکەوت ئەوا لەنێو ئەوانەدایە کە لە سۆڤیەت پێیان دەگوترێ «لادەر». سوودیش بۆ گشت ئەم وەڵاتانە لەوەدایە کۆتوبەندی ڕێبەستن، ڕێگرتن و تاوانبار کردن لە بواری نووسین و بڵاو کردنەوەدا کەم بکاتەوە. لە منیشەوە بۆ ئەدیب و شاعیر و هونەرمەندان هەموو ڕێز و سڵاوێک.

**دەردی ئەدیبان!**

**باسێک زۆر لە دەردی ئەدیبان دەکرێت بەڵام تۆ هیچت تێدا نەگوتوە. هیوادارین لێرەدا بۆچوونێکی نوێتمان دەست کەوێت... لەتەکمانیت؟**

دەڵێم ئەرێ... خوێندنەوەم پەرتە. چەند جارێک زووتر باسم لە هەلومەرجی خۆم کردووە، گوتوومە من کتێبانێک دەخوێنمەوە یان دیارین یان قەرز. من لە گشت ڕوویەکەوە بێتوانام لەوەی بەنێو کتێبفرۆشاندا بگەڕێم و بەرهەم هەڵبژێرم. لەبەر ئەوە سەختە بۆ من دەردی ئەدیبان دیاری بکەم، ئەویش گریمان ئەو مافە بەرینەم هەبێت بۆ هەڵسەنگاندن. من ئەگەر لە گشت ئەدیبان بخوێنمەوە و لێشیان تێبگەم دیسان هەر ناتوانم ڕایەک دەربڕم دەربارەی یەکبەیەکیان چونکە هەم زۆرن و هەم نووسینیان زۆرە.

جا گەر مۆڵەت هەبێت «تایبەتکاری» جێ بهێڵێن بۆ «گشتکاری» چاوپۆشیش بکرێت لەوەی خوێندنەوەی کەمم دەکەمە بنەمای هەڵبەستنی بیروڕام، بەڵام پشتیوانی هەیە لە لایەن لۆژیکی داکەوت و فەرمانەکانی، ئەوسا ڕێ دەدەم بە خۆم بڵێم ئەو دەردەی ئەدیب بەدەگمەن لێی ڕزگار دەبێت بریتییە لە لاسایی کردنەوەی ڕەوتی ئەورووپایی لە شێواز، وێنا و خەریکبووندا.

لاسایی کردنەوە ناکاتەوە هەرسی خۆراک، زۆربەی جار ئەنجامی هەرس دەبێتە نەوزادێکی دروست ئەویش بە چێوەی چاوەنۆڕیمان لە زانێکی ئاسایی بە چاک و خراپییەوە. ژیار و فەرهەنگی ڕاستینە چ ڕەسەن بێ و چ هاوردە، لە ئەنجامی پێویستیبوونی، ناچاریبوونی و هەروەها باش دەرک کردنی، هۆش و چاو ئاواڵە دەکەن بە ڕووی سەودایەک لەگەڵ داکەوت بگونجێ. ئەگەر دەستەیەک لەمانەی

خاوەن فەرهەنگی ڕاستینەن گەشتێکی «ئەهوار»کان[80] بکەن پەنا تەنها بۆ ئەوە دەبەن کە لە زەلکاودا پێویست پێیەتی، تەنانەت پێشدەستی دەکەن بۆ نوێژ کردن، سەردەستی کراسەکەیان ئاواڵە دەکەن بۆ دەستنوێژ.

من تێدەگەم و پەی دەبەم، بۆ نموونە، بە چیرۆکنووسێک دەستپێکی چیرۆکەکەی بە شێوازێکی کۆنی بێخەوش داڕێژێت و بڵێت: لە فلانە گوند بەر لە ئەوەندە ساڵ، خەڵکی لێ بوو... بارودۆخی وەها بوو... ئەوە ڕوویدا... هتد و پاشان بێ هەناسەسواریی و بە تەواوی تواناوە بەردەوام بێت لەسەر گێڕانەوەی بابەت و چارەسەری گرێ و چاودێریی ڕستن. پێشوازیی گەرمتریش لە کەسێک ناکەم بێت چیرۆکەکەی لە ناوەڕاستەوە بڕێسێت و بەرەو دوا بگەڕێتەوە (فلاش باک) ئەویش بە کورتهێنانێکی دیارەوە لە میراتگیری شێوازی چیرۆکنووسانی ڕەسەنی ئەوروپاییەوە. لەمەشدا چ دوژمنایەتی و ڕەت کردنەوەی تێدا نییە بۆ شێوازی ڕۆمانی نوێ، بەڵام کۆیلەبەستنی توانای نووسەری عیراقی لە لایەن ئەم شێوازانەوە، سەرزەنشت دەکەم.

خەریکە پێداگریش دەکەم لەسەر ئەوەی زاڵبوونی لاسایی کردنەوەی ڕواڵەتی بۆ شێوازی ڕۆژاواکرد هۆکارە بۆ گەڕانەوەی توند و گرژی زۆر کەس، لە لاوان و کەسانی بەتەمەن نێزیک لە لاوانەوە، بۆ بەها کۆنەکان. ئەوەتا خۆهەڵواسین بە شێوازەوە وەها جێی نێوەڕۆکی گرتۆتەوە زۆر گوتنەوەی چەمکەکانی سۆسیالیزم، چ توندڕەوی چ میانڕەوی، نەیتوانی یەک بەر بێنێتە بەرهەم، مەگەر دروشم، دیوارنووسی و درودکێشان. ئەمانەش سەرلەبەر و دوو جار کەڕەت

80- ئەهوار: «اهوار» ناوە بۆ ناوچە زەلکاوییەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی عیراق.

خۆشیان بکەیتەوە ناتوانن بنبانێک لە پووش بەسەر کووخێکی قوڕکردەوە هەڵبەستن.

لاسایی کردنەوە بە گوتاری ڕێبوارانە تەواو نابێت، گەر کەماسی و ناڕوونی لەم گوتارەمدا هەیە، دەبێ خوێنەر لای خۆیەوە بۆ ڕۆشن کردنەوەیان یاریدەرم بێت.

**ئەدیبی ئابڕوومەند!**

**وابەستبوون (ئیلتیزام) و ئابڕوو لە هەڵویستی ئەدیبدا یەک باسن، بەڵام مامۆستا مەسعوود لێت دەپرسین: ئایە دەتوانیت دەستوورێکی پێنج بەندی داڕێژیت بۆ ئابڕوومەندیی ئەدیب؟**

شێوازی پرسیارەکە پێویستی بە دەستکارییە. دەشێ ئەدیب بێ هیچ مەرجێک ئابڕوومەند بێت، هەر وەک مرۆڤیکی بێسەوادی ئابڕوومەند کە ئابڕووی چ بەڵگەیەکی فەرهەنگی لە پشت نییە. بەڵام ئەدیب پتر لە کەسی بێسەواد بەرۆکی دەگیرێ چونکە هەر مرۆڤێک ڕووی گوتاری لە هۆشی خەڵک و بەرژەوەندییان بێت مەرجە لەسەری پەیجۆری بکات لە ئاسوودەیی، دڵنیایی، سەلامەتی و پێشکەوتن... هتد لە گوتار، پەخشان کردن و ڕەفتاردا. ئەدیب لێرەدا برای سیاسەتمەداری دەرەوەی دەسەڵاتە. هەردووکیشیان لە بواری بەرپرسایەتیی گشتیدا لە پاش لایەنی فەرمانڕەواوە دێن. لەم باسەشدا هاوشانی دیکەشیان هەیە، وەک: دەمڕاستانی دینی، کەسایەتیی فەرهەنگی نێو فێرگە و زانکۆکان، ئەوانەی دەماری ئابووریی ڕشتە جیاوازەکانیان لەدەستە...

دەمێنێتەوە باسی پێشنیازم بۆ پێنج مەرج دەربارەی ئابڕوو لە ئەدەبی ئەدیبدا و لەوەیشە بەشێکیان جێی مشتومڕ بن، بەڵام یەکەمیان بەتایبەتی مشتومڕ هەڵناگرێت:

1. له نووسیندا له‌گه‌ڵ خه‌ڵک ڕاستگۆ بێت. هیچ شتێکیش نابێته پاساو بۆ به‌زاندنی ئه‌م مه‌رجه مه‌گه‌ر ده‌گمه‌نی ده‌گمه‌ن وه‌ک ئه‌وه‌ی دۆخێک بێته پێش ڕاستی زیانی هه‌بێ بۆ کۆمه‌ڵگه. ئه‌گه‌ر وابه‌سته‌بوونی سیاسیی ناکۆک هات له‌گه‌ڵ وابه‌سته‌بوونی ئه‌ده‌بی به‌رانبه‌ر خه‌ڵک و ئه‌و دۆخه‌ش له ئارادا نه‌بێت که باسی هات، ئه‌وا ئه‌دیب تاوانبار ده‌بێت گه‌ر له‌ته‌ک خه‌ڵکدا په‌ناوپێچی بکات.
2. هه‌تا ئه‌وپه‌ڕی توانا هه‌وڵ بدات ئاستی «زانیار»ی خۆی سه‌ربخات بۆ ڕێکاری به‌رپرسایه‌تیی خۆی، چونکه فه‌رهه‌نگی کرچوکاڵ ده‌بێته میوه‌ی نه‌گه‌ییو، زیان ده‌دات له سوودی زانیار.
3. هه‌وڵ بدات دیدی خۆی دابڕێت له باوه‌ڕ و گریمانه‌ی ئایدیۆلۆژیی چه‌قبه‌ستوو بۆ ئه‌وه‌ی ببێته ئامرازێکی مرۆڤکارانه‌ی جێباوه‌ڕ بۆ ڕێبه‌رایه‌تیی خه‌ڵک.
4. له ڕێبازی خۆیدا سه‌پاندنی زۆرکارانه‌ی باوه‌ڕ ڕه‌ت بکاته‌وه و خه‌بات بکات دژ به هه‌ر ئاڕاسته‌یه‌ک ڕه‌وایه‌تی بداته زه‌وت کردنی ئازادیی خه‌ڵک.
5. شه‌رم بکات له هه‌وڵ دان بۆ په‌یدا کردنی ناوداری به نرخی داشکانی جۆرایه‌تیی کاڵای خۆی و له‌بیری نه‌چێت که نه‌وه‌ی داهاتوومان ئه‌مانه‌تن له گه‌ردنی ئه‌ودا.

## هێزی نووسەر یان هێزی خوێنەر؟

**مامۆستا مەسعوود، لە مێژوودا، کامیان بەهێزترن، نووسەر یان خوێنەر؟**

پرسیارەکەت باسی مریشک و هێلکە دەهێنێتەوە یاد بە سەلماندنی ئەوەی مریشک زیادتر و گرانترە چونکە یەک هێلکە تەنها یەک مریشکی لێ هەڵدێت بەڵام دوور نییە یەک مریشک سەدان هێلکە دابنێن...

دەکرێ بۆ بڕیاردان پەنا بەرینە بەر شرۆڤەکارییەکی ساکار بۆ بارودۆخی نووسەر و خوێنەر: لە بەراوردا نووسەر وەک مامۆستایە و خوێنەریش وەک فێرخواز. لە تەرازووی هێزدا جیاوازی زۆرە لە نێوان پێگەی مامۆستا و پێگەی فێرخواز. بەڵام ئەم مژارە بە پەیدابوونی هۆکاری «هێزی ژیار» لە هاوکێشەکەدا دیوێکی دیکەش پەیدا دەکات چونکە پێگە لە وەڵاتانی ژیارمەنددا نابێتە مایەی بەکارهێنانی دەسەڵات بە ئارەزووی خاوەن پێگە. ئەوەتا مرۆڤی بەهێز لە وەڵاتی بۆ نموونە سویسرە، بێ زۆر لە خۆ کردن خووی گرتووە بە پەیڕەوی کردنی ڕەفتاری ژیارمەندانە. بەڵام لە وەڵاتانی دواکەتوودا بارەکە جیاوازە، لەملا شانازی بە توانای خۆ زاڵ کردن خەسڵەتی گشتییە. بەدەگمەن نەبێت، تاک یان چەند تاکێک نابینی خۆی بەرزتر ڕاگرێت لە نزمیی شانازی کردن بە هێزی هوڤیکار.[81]

لەم ڕوانگەیەوە دەتوانین بڵێین جەماوەر لە وەڵاتانی پێشکەوتوودا خاوەن هێزی دابڕە بەڵام دواکەوتنی خەڵک بەگشتی لە وەڵاتانی دواکەوتوودا بڕیاری دوو دەرهاویشتەی تێهەڵکێشی داوە:

- یەکەم لاوازی لە کاریگەریی ئاپۆرەی زۆرژماردا

81- هوڤیکار: وحشي - بە واتای دڕندە.

- دووەم: کە دەرئەنجامی خاڵی یەکەمە، لە وەڵاتی وەهادا ئاپۆرەی زۆرژمار چاوەڕێی فەرمان، ڕێنوێنی و ئامۆژگاری و بابەتی وەهایە لە سەرەوە دابەزێت. خوێنەرانیش لەم دیدەوە دەبنە لایەنی «وەرگر» بە هەژارییەکی توندەوە لە توانای هەڵبژاردنی هەڵوێستدا.

لەوەش بترازێت، خوێنەران جگە لەوەی توانای خۆسەپاندنیان نییە ئاشکرایشە ناچارن چاوەڕێی هۆش ڕوون کردنەوە بن لە لایەن کەسانی مامۆستا، نووسەر و زاناوە. ئەمەش هۆکارێکی ناوتوێژە لە «دووەم»دا دەچێتە پاڵ ئەم گوتەیە و تای «گوتاربێژ» سەنگینتر دەکات لەچاو «وەرگر»دا.

وێرای ئەوەش ئاپۆرەی زۆرژماری داماڵراو لە هێزی خۆسەپاندن گرینگی خۆی هەر هەیە چونکە گەر پێشوازی لە بابەتێک کرد سەنگی دەداتێ و گەر بابەتێکی وێڵ کرد سەنگی دەشکێنێت. بەگشتیش ئەم دیاردەیە ڕەمەکی و بێ مەبەست ڕوو دەدات...

## تایبەتمەندیی خوێنەری عیراقی

### ئایە خوێنەرانی عیراق چینچینن؟

خوێنەران بەپێی تەمەن، خولیا، ژینگەی تێیدا دەژین، توانای کڕینکارییان[82] و هۆکاری دیکە دابەش دەبن بەسەر مەیل و تایبەتمەندیی فرەجۆردا. دەشێ زۆرینەی هەر دەستەیەک مەیلی جۆرێک لە خوێندنەوەیان هەبێ بەڵام کۆکەرەوەیەکی گرینگ هەیە کۆیان دەکاتەوە، بابڵێم زۆربەیان کۆ دەکاتەوە: ئەمانە، ئەگەر کەش بەدەر بێت لە ڕێبەست و خڵافێنەر، زیاتر مەیل بگرە عیشقیان هەیە

---

82- توانای کڕینکار: القوة الشرائية.

بۆ نووسینی بوێری جیددی و ڕاستگۆ، پشتیش دەکەنە نووسینی خۆڵەمێشی بێ ڕەنگ و بەدەر لە ورووژاندن.

دەتوانم بێ زمانپارێزی بڵێم لە گشت دەستەکاندا زۆربەی خوێنەران گەر نەڵیم هەموویان بە هەڵپەیەکی بەرچاوەوە ڕوو دەکەنە نووسینی بەرۆکگر.[83] ئەم دیاردەیە گشت وەڵاتان دەگرێتەوە چونکە خەڵک بەدەم کاتەوە بێزار دەبن لە بابەتی ئاشنای پێڕاهاتوو، بە نووسینیشەوە.

ئەوەی گوتم وێرای کەم تێکەڵیمە لەگەڵ خەڵک لە دەرەوەی ماڵی خۆم، بەڵام خەڵک لە ماڵی خۆم دەبینم و لێیان دەبیستم، جاریش هەیە خوانی تایبەت لەتەک کەسانی خاوەن ڕا و کەسانی گوێزەوەی ئاگاداریی سەربە دەنگوباسی کۆمەڵایەتی کۆمان دەکاتەوە. لەوەشدا کە فریای دیداری ناکەوم دەگەڕێمەوە بۆ ئاشکرایی بابەت. بەڵام ئارەزووی زایەند (سێکس)، ورووژانی سۆزەکی، داستانی قارەمانەتی، نهێنی ڕووداوی شاراوە و باسی لەم جۆرانەم لە بابەتەکە دەر کرد چونکە دەکەونە دەرەوەی پێوانەی بابەتی چاوەڕوانکراو یان ئاشنا و شیاو بۆ وەدەست هێنانی تایبەتمەندیی خوێنەر.

**نووسین چارەنووسی منە!**

**باشە مامۆستا مەسعوود کەی دەست لە نووسین هەڵدەگریت؟**

دەستهەڵگرتنی خۆویست کاتێک ڕوو دەدات هۆشم گڕی نەمێنێ و دەستم خامە نەگرێت. هەرچی دەستهەڵگرتنی ناچارییە دەبێتە بەرهەمی فەرمانی ڕێبەست یان هاتنە کایەی بارودۆخی وەها کە بڵاو کردنەوە تێیدا شیاو نەبێت، یان کاتێک فەرهەنگ لە کۆمەڵگەدا ببێتە

83- بەرۆک گرتن: تحدي، بەرۆکگر: متحدي.

خاشاک، یان بە ڕووداوی دوورەدەست، بۆ نموونە خوێنەران داوا بکەن دەست لە نووسین هەڵبگرم.

زۆر بە دووری دەزانم هەستی ناکامی، زاڵبوونی بێهومێدی و ڕەشبینی لە خۆمدا ببێتە هۆی گۆشەگیریی پەککەوتن و دابڕانم لە نووسین و خۆ ڕوون کردنەوە. من لەبەر ئەوەی هەر بابەتێک ماف و سەنگی خۆی دەدەمێ ڕێگە نادەم نائومێدی لەمیان تێکەڵ بێت لەگەڵ هیوابوون بەویان. هەتا توانای بەخشینم هەبێت و بارودۆخی وەڵات لەبار بێت نە وازدەهێنم، نە دەوەستم و نە خاوەخاو دەکەم. لەم گوتەیەشمدا چ نامۆیی و نارەوایەتیی تێدا نییە چونکە ئەوپەڕی توانام لە سوودبەخشین و سوودگیری هەر خەریکبوونە بە توانای نووسینمەوە. دەبێ بژارەی دیکە بۆ کەسی وەک من لەم بارودۆخەی مندا چی بێت؟ چ بژارەی دیکە نییە. نووسین چارەنووسی منە!

## دەی مادام نووسین چارەنووسی تۆیە، ئەدی کەی مەسعوود محەمەد دەبێتە نووسەرێکی گەلێر؟[84]

گەر مەبەست لە گەلێر بەکارهێنانی زمانی عارەبیی ڕەمەکی بێت ئەوا دەست نادات. بەڵام گەر مەبەست ناوداربوون بێت لە نێو ئاپۆرەی خەڵکدا یان کێشبوونی دڵی خەڵکە بۆ لای من ئەوا ڕێگەی ئاسان بریتییە لە نووسین دەربارەی ئەو بابەتانەی نێزیکە لە خواستی خەڵکی ساکارەوە و بە زمانێکیش لایان گونجاو بێت. ڕێگەی سەختیش بریتییە لە بەردەوامبوون لەسەر نووسینی جیددی سەنگین دەربارەی باسگەلی گرینگ بۆ ئەوەی هەم بۆ نووسین و هەم بۆ خۆیشم ناودارییەکی وەها پەیدا بکات لە بەستێنی ڕۆشنبیران دەرباز بێت...

84- گەلێر: شعبي - خاوەن جەماوەر.

له مەیدانی کوردیدا بەشێک لەو ئامانجەم پێکاوە ئەویش بە نووسینی جیدی و فرەژمارم بەم زمانە، دەشبینم کوردی دەرەوەی عیراق بەهەندیان دەگرن و داوایان دەکەن. دەمێنێتەوە مەیدانی عارەبی: لێرەدا من، بەپێی دەرفەتی بڵاوبوونەوەی نووسینەکانم لە دەرەوەی بەغدا، پلەڕەوتی[85] دەکەم. بەڵام بڵاوبوونەوە لە ئامانجەکانی من نییە، گەرچی لاریم لێی نییە و بگرە پێشوازیشی لێ دەکەم بەڵام نەک بە نرخی ڕێکاری شێواز و نێوەڕۆکی نووسینم... «هەر کەس بۆ ئەو ئامانجەی ئافرێنراوە، توانای پێدراوە».[86] پەیوەستبوونم بە بنەمای ڕوو کردنە هۆشی تایبەت - هۆشی ئەوانەی توانایان هەیە بۆ ڕاستاندنی خێر و ڕێبەستنی بەڵا - ڕێ نادات تەنگیی ڕووبەری «گەلێربوون»ـم لە نەخشەی خۆمدا جێی بۆ «زەرەر کردن» بکاتەوە.

## ئەدی نووسەری گەلێر لە عیراقدا کێن؟

بۆ وەڵامدانەوەی دروست دەبێ ئاگاداری «گەلێربوون» بین لە گشت ئەو زمانگەلەی فەرهەنگی بڵاوکراوەی هەیە لە عیراقدا کە دەکاتەوە عارەبی، کوردی، تورکومانی، سوریانی. زمانگەلی ئەورووپایی خەڵکی خۆیان نییە لە وەڵاتەکەمان بەر ئەم باسە ناکەون گەرچی بەرهەمیان هەیە لێرە چونکە خوێنەرانیان هەر عیراقیی خاوەن زمانەکانی سەرەوەن.

لە ڕوانگەی ڕاستگۆیی ڕەهاوە دەڵێم من تەنها ئاگاداری گەلێربوونی نووسەرانی زمانی کوردیم گەرچی زایەڵەی ناوداریی یەک دوو نووسەری عارەبیش لە گەلێربوون و برەو پەیدا کردنی نووسینیان

---

85- پلەڕەوتی: تدرج.

86- ئاماژەی بە حەدیسی پێغەمبەر: «كُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ».

دەگاتە لام، بەڵام ناوهێنانیان لە چێوەی ئەم پرسیارەدا بە پێویست نازانم، ببوورن.

## داهێنان پێویستی بە «خۆتەرخان کردن»ـە

**ئایە داوای «خۆتەرخان کردن» دەکەیت بۆ پرۆژەی نووسیارانەت؟ ئایە خۆتەرخان کردن سوودبەخشە بۆ داهێنەری پڕبەرهەم؟**

خۆتەرخان کردن خەونێکە نە هاتە دی و نە دێتە دی، مانگەشەو سەر لە ئێوارەوە دیارە... لەم دۆخەی خۆمدا کە لێی ئاگادارم و لەم بەرەژانە هزرییەی لە زەمەنێکدا بەدەستییەوە پەرێشانم دەبم هەتا مەلۆتکەی هزری دەزێت، «خۆتەرخان کردن»ی توانا و پشوودەری بێگەرد و بێ نیگەرانی دەبێتە خۆر بۆ کاتی خونچە کردن و پاشان بۆ هەڵپێکان و بەر کردن.

خەریکبوون بە کاروبارێک بۆ ڕێچکەی هۆش ڕووەو ئامانج ببێتە ڕێگر و لای بدات بەرەو پەراوێزەکانی گوزەران و کێشەگەلی لە ڕامان نامۆ، لە قووڵاییەکی لێی ڕۆچووە سەرکەوتەی بکات بۆ چڵکی بانکەوتوو، بە ڕاستی بۆ کەسێک پێویستی بە خۆتەرخان کردن بێت دەبێتە «هەژەندی فەرهەنگی» و دەکاتەوە زیندەبەچاڵ کردن، کوژانەوە و نابوود کردن بەیەکەوە.

هزری وردەکار لە بابەتگەلی قووڵی هەم لە نێو خۆدا ئاڵۆسکاو و هەم لەگەڵ بابەتی دیکەی هاوجۆر لە وردی و ئاڵۆسکاندا، ئەم هزرە، یان ئەم ناوەندە تیشکینەی دەکەوێتە سەر خاڵی یەکتربڕی هاوکێشە هزرییە یەکجار هەستیارەکان وەک دڵۆپە جیوەیەکە بزۆز، نە دەگیرێ، نە جڵەو دەکرێ و نە دەستاژۆ دەبێ. جا گەر پەرۆشییەکی ڕێبوارانە لە دەرگەی دا، وەک میوانی ناکاو یان وشکهاتنی مەرەکەب لە مەرەکەبداندا بێ ئەوەی مەرەکەبی دیکەی یەدەک بەردەست بێت،

یان نەمانی کاخەزی گونجاو بۆ نووسین، یان تێکچوونی ئاوکوڵێن[87] کە چاک کردنەوەی چەندین ڕۆژ دەخایەنێت و بڕانی ئاوی گەرم لە زستاندا... گەر ئەم یان ئەو یان ئەوەی دیکەیان ڕووی دا، ئەو خەسڵەتە جیوەکارە لەو بیرۆکە خز و تەنگەتاوە لە بنەڕەتەوە دەپووکێتەوە [...] هەر وەک هەڵمی هەستاو لە مەنجەڵی نیسکەوە بەرەو پەنهان.

دەڵێن گۆیا ژان بە تیژ کردنەوەی توانا دەبێتە هۆی ڕسکانی بلیمەتیی هونەرمەند. دوور نییە ئەم بۆچوونە بەڕاست بگەڕێ لە هونەر و بەهرەی وەها کە پێویستی بە وورووژان و زیادە هەستیارییە، بەڵام هزر و هەر بابەتێکی دیکە لە مرۆڤەوە بێت و پێویستی بە سەلماندن بێت، لە نێوەڕۆکدا دژوەستاوی وورووژانە. نێزیکترین نموونە بۆ ئەم گوتەیە بریتییە لە بەهرەی بیناساز کاتێک دیواری ستوونی هەڵدەچنێت، وورووژان و تووڕەبوون دەبنە مایەی لەرزینی گوبان[88] لە دەستیدا و خشتەکە نارێک دادەنێت و دیوار خوار دەردەچێت.

بۆ وەڵامدانەوەی پرسیاری: سوودی خۆتەرخان کردن بۆ داهێنان، دەڵێم خۆتەرخان کردن پێویستە بەڵام پاش توانایی، ئازموودەیی و دەربازبوون بە دۆخەکانی دەمەزەرد کردنی داهێناندا. مرۆڤی دەستپێک هەرچەند زیرەک و درەوشاوەش بێت سوود نابینێت لە گۆشەگیری و دابڕان لە تەوژمی ژیانی پڕ هاتوهاوار. گیر کردنی دید و هزر لە ڕووپەلی گوتەی ژیرانەی نیمچە بەتاڵ چ بەرهەمێکی دەبێت؟ لایەنەکانی هاوکێشەگەلی زادەی سروشتناسی، مرۆڤناسی و دەرهەستایەتی لە کوێوە پەیدا بکات گەر هۆش ئاگای لە خاڵە

87- ئاوکوڵێن: بۆیلەر، سخان.

88- گوبان: شاقول - ئامرازێکە وەستای بیناساز بەکاری دەهێنێت بۆ ڕاگرتنی ڕێکوەستانی بینا.

بەرایيەکانیان نەبێت؟ پرسیارەکە خۆیشی لە کۆتای دەستەواژەکەدا، بە «پڕبەرهەم» چێوەیەکی دروستی بۆ باسەکە کێشاوە.

**ڕەخنە و ڕەخنەکاری!**

**مامۆستا مەسعوود، بۆچوونت چییە دەربارەی ڕەخنەی ڕەخنەگرانی عیراق؟**

گەر ئەو مەرجە سەپێنراوانە بە پێوەر بگرین کە مافی ڕەخنە گرتن دەداتە ڕەخنەگر ئەوا من مافی ڕەخنە گرتنم نییە لە ڕەخنە. بەوەش تەنها خەسڵەتی ئاخێوەرم بۆ دەمێنێتەوە بیروڕای خۆم دەربڕم.

ئەوەندەی من ئاگادارىم لە ڕەخنە بڵاوکراوەکان دەبینم هەرە باشەکانیان ئەوانەن دەچنە سەر بنەمای ڕێچکە هەڵگرتنەوەی ڕۆژاوا لە نێوماندا، لادانی هونەریمان لە داڕشتنی ڕۆمان، گوتار ... هەرە باشیانە لە دیاری کردنی لایەنی باش و لایەنی خراپ لە لاسایی کردنەوەی بەهێز و جێگیر. ئەوەش بە تێبینی جیاوازیی نێوان ئەو دوو فەرهەنگە، جیاوازییەکانیش دەگەڕێنەوە بۆ بابەتی وەک بەها و شێوازی ڕەفتار لە جڤاتی ڕۆژاوا و ڕۆژهەڵات، بەتایبەتیش ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی. بەدترین ڕەخنەکاری ئەوەیە سووکایەتی، گرژی و دڵڕەشی توندی لەگەڵدا بێت، ئەوانەش زۆرن.

دیومە ڕەخنەگر لە هونەر و لە بابەتی دیکەش، زیادتر خەریکی ڕێکخستنی جوانیی شێوازن وەک لەو نێوەڕۆکەی مایەی ڕەخنە گرتنە. بەتایبەتیش لە هونەردا ڕەخنەگر دەبینی تا ئاستی خنکان ڕەخنە لە شێواز دەگرێت. دیومە لە نمایشی هەڵسەنگاندنی گۆرانی، ئەمیان دەگەیینە کەشکەڵان چونکە پەڕینەوەی لە ئاوازێکەوە و بۆ ئاوازێک سەرکەوتوو بووە، گەرچی هەم دەنگی بەدەر بووە لە جوانی و هەم

دووریش بووه له گەرمیی پێشکەشکاری و هەست کردن بەوەی دەیچرێ، هەر دەتگوت شەترەنجبازە، داوای لێ کراوە بێ هەڵە کردن پارچەیەک بجووڵێنێت.

جوانیی شێواز پێویستە لە باسێکدا شێواز تێیدا بەشێکی گرینگ یان گرینگترین بەش بێت. ئاخر نێوەرۆک لە پەیکەرتاشییەکی شێواو یان تابلۆیەکی ناشیریندا نە دڵی کەس ڕادەکێشێ و نە دەبێتە پاساو. جوانکاریمان لە نەخش و نیگارکێشیدا دیوە گەیشتۆتە ئەوپەڕی جوانی بێ ئەوەی نێوەرۆکی جڤاکیی هەبێت، مەگەر بێین ڕاگرتنی هاوڕەنگی، هاوئاوازی، تەواوکاری، ڕێژەی ماتەماتیکی ئەندازەکاری لە چەمکێشی، ڕاستکێشی وشکانی هێل، تێکئالانی شێوە لە تابلۆی نیگارکێشی و نەخشکاریدا، بە دەستکەوتێکی جڤاکی دابنێین لە بەهرە و بینین، ئەویش دەستکەوتێکی ڕووخسارە نەک نێوەرۆک.

لە ڕەخنەکاری و لە بابەتی دیکەشدا ئێمە سەرەتامانە و زۆر جاریش لاساکەرەوەین. ڕاستە پێشکەوتن لە قۆناخەکانیدا داوای کات و ئەرک دەکات بەڵام ئەو کۆسپانەی لە ناخماندا پەیدا دەبن لە ئەنجامی پەستانی پاشخانی کۆمەڵایەتی و ڕزۆکیی ژیاری تازەمان دەبنە هۆی درێژەدان بە تەمەنی دواکەوتن.

لە وەڵاتانی سۆسیالستدا دەوڵەت بەرپرسی یەکەم، دووەم، سێیەم و زیاتریشە چونکە دەسەڵاتی هەیە بەسەر دەستاوێژەکانی ڕۆشناکی، ئاڕاستە کردن، بەرهەمهێنان و هەناردن... بەرپرسایەتیی یەکەمیش لەم بوارەدا باسێکی مفتە، نە یەک فلسی تێ دەچێت و نە یەک «کالۆری» ی گەرمایی. بگرە دەرفەتێکی خۆشی والآییە بۆ کەسانی بەرهەمهێن لە گشت بوارێکدا بۆ ئەوەی سەربەش[89] و ڕاگری

---

89- سەربەش: بەڕێوەبەری بەش - مدیر قسم.

ئاساییش[90] یان نازانم چی نەبێتە هەژدیهایەک دڵگەرمی خامۆش بکات، زیرەکی بکوژێت و تەنبەڵ و گەمژەڵ پێی گەشە بکەن. ئەمەش ڕاستییەکە مشتومڕ هەڵناگرێت.

**ڕەخنە... بەرەو ڕاگەیاندن!**

**مامۆستا مەسعوود، تۆ کەسێکی لە پیشەوەرانی خامە و لە بواری ڕاگەیاندا نەخشی خۆت هەیە... ئایە تۆ ڕازیت لە ڕاگەیاندمان؟**

پێویستە کەسانی بەرپرس، کە سەروکاریان لەتەک ڕاگەیاندن و ڕووخسارەکانی دیکەی فەرهەنگی و ڕۆشنا کردنەوە هەیە، خۆیان لە ڕێکارێکی بەرزی فەرهەنگی، سنگفرەوانی و دووربینیدا بن. عیراق وەک دەزانین وەڵاتێکە ئاسایشی دابینە، لەبەر ئەوە پێویستی بە زیادەڕۆیی نییە لە ڕێگریدا. خەڵک مرۆڤن خۆڕسک سنووری سەلامەتی دەزانن.

جا هەر چۆن بۆ نموونە خراپ دابەشینی کاڵا لە بازاڕدا خۆیەتی هۆکار بۆ نیگەرانی و خویابوونی بێزاری بە ڕووخسارانەوە نەک بەدویستیی کەسانی نیگەران و بێزار، هەروەها تووڕەبوونی نووسەرێک، ڕێ لە گوتاری یان کتێبێکی گیراوە کە هیچ ورووژێنتر نەبووە لە گوتاری دیکەی ڕێپێدراو، هۆکاری دەگەڕێتەوە بۆ خراپ بڕیاردانی بەرپرسی فەرمی لە مۆڵەتدان و ڕێبەستنی نەک بۆ نووسەر.

ڕاگەیاندن زمانی ئاپۆری خەڵکە - یان دەبا وەها بێت - هەورازتریش بڕۆین، هونەر و پیشەیە، ساز کردن و ڕێکخستنە، بگرە بوونەوەرێکی ژینەوەرە گەشە دەکات و دەڕسکێ، لەوانەیشە لاواز بێت و بمرێت. لەبەر ئەوە دەبێت ئازادیی پێویست بۆ کەسانی سەربە ڕاگەیاندن

---

90- ڕاگری ئاسایش: ضابط الأمن.

دابین بکرێ بۆ ئەوەی ڕۆژنامەکانیان سەرنجڕاکێش، ڕۆشنبەخش و ڕاستگۆبن و تا ئەوپەڕی ڕادەی توانا دڵڕاگری خوێنەر و نووسەر بن. جا گەر ئەمە دەبێتە هۆی کەم کردنەوەی زاڵبوونی بەشێک لە کەسانی فەرمی بەسەر ڕاگەیاندندا دەبا بنۆشن لەو دڵارامییەی بۆیان دەمێنێتەوە پاش لابردنی ئەو بەرپرسایەتییەی سەر شانیان. دونیا ئارام و ئەوانیش دڵارام، گشت لایەنێکیش دڵاسوودە و ڕازی.

**بارودۆخی نووسەری عیراقی**

**ئەی دەربارەی بزاڤی کتێبی عیراقی دەڵێیت چی؟**

دەبینم بە بزاڤ چالاک و بە ژمارە فرەیە و چەند بەرهەمێکی جیددیش هەیە لە نێویاندا، ئەوەش بەپێی دەرفەتی خوێندنەوەم کە زۆر فرەوان نییە بەڵام زایەڵەی چاپەمەنی دەبیستم. وەک سەرنجێکیش لێرەدا جێی باس کردن بێت دەڵێم ئەوەی پێی دەگوترێ «سنوورشکێنی» لە بواری فەرهەنگیدا بەرهەمی عیراقی تێدا کەمە. بە ڕەچاو گرتنی بارودۆخی کاربینی، بازاڕی کاخەز، نرخ و دۆخی فرۆشیاری دیارە لەوە باشتری لێ پەیدا نابێت.

کتێب جودایە لە نان و گێزەر، لە گۆڤارێکی سەرنجڕاکێش و نمایشێکی سینەما، لە وەرزشی تۆپێن و مەلە، هەمووشیان جەماوەری دەستەبەری خۆیان هەیە. کتێب کاڵای هزر و دیدە، لە مەرجی ڕسکان، گەشانەوە و پەخشان کردندا نازی زۆرە. بەسە بڵێم مۆرەیەکی چاوسوورکەرەوەی پۆلیسێک ڕووەو دوندێک لە دوندەکانی هزر و فەلسەفە دەبێتە هۆی خنکاندنی بەرهەمێک لە هەناویدا دەشیا ببێتە زادەی چاکەبەخشی گیانی. گەر بەختیش یار بێت و مەلۆتکە بزێت دیسان گەشتێکی درێژمەودای لەڕێیە تا دەگاتە برەوسەندن، چونکە پێویستی بە خەڵکە بیخوێننەوە و دەرکی بکەن، ژمارەشیان ئەوەندە

بێت خەرجیی پڕ بکاتەوە و گوزەران دابین بکات. دەنا بۆ پەخشان کردن دەبێ پەنا بەرێتە بەر ئەو دەزگە حکوومەتییانە تەرخانن بۆ کاروباری فەرهەنگی. لەوانەیشە ئەم دەزگە حکوومەتییانە مەرجی تایبەتی خۆیان هەبێت نەگونجێن لەگەڵ مەزاجی نووسەر، یان لەگەڵ باوەڕ و بۆچوونی نووسەر دەربارەی چاکە و خراپە.

ئەمانە نموونەن لە هۆکاری کاریگەر بەسەر بزاڤی کتێب لە عیراق و هاوجۆری دیکەی لە وەڵاتانێک، لێیانەوە دەتوانین پەی بەرین بەو بارودۆخە.

## ئەی «کۆڕی زانیاری عیراق» لە چ بارێکدایە؟

لە نێزیکەوە ئاگام لە بارودۆخی نییە، نازانم تا چ ڕادەیەک لە کاروباری خۆیدا سەرفەرازە. جاروباری دەگمەن هەڵدەکەوێت سەرەدانیان بکەم بەڵام نیگای پەلە نابێتە یاریدەر بۆ هەڵبەستنی بۆچوون. بەڵام هەست دەکەم مەودا و ڕادەی چالاکی هاوکارانیان جیاوازیی تێدایە.

بە بەراورد لەگەڵ سەردەمی پێش لێکدانی هەر سێ «کۆڕ»ەکە لە یەک کۆڕدا، مووچەی دەستخۆشی [مکافأة] دە هێندە زیادی کردووە، دەشێ لەم گۆشەنیگایەوە بڵێم هۆکارێکی تازەبابەتی کە جاران نەبووە، بۆتە هۆی پێشنەکەوتنی چالاکی تێیدا، باسیش لە پێوەری زیاد کردنی مووچە و زیاد کردنی دیکەش نییە، بگرە چالاکیی بەشێک لە دەستەکانی بە ڕادەیەکی بەرچاو دابەزیون.

لەبەر ئەوە هیوادارم گفتوگۆیەک لەگەڵ سەرۆکی کۆڕ: دوکتۆر «سالح ئەحمەد ئەلعەلی»[91]ی دۆستم ساز بێت بۆ ڕوون کردنەوەی پێویست دەربارەی کەشی نێوخۆی ئەم کۆشکە مەزنەی دونیای ئەکادێمی و فەرهەنگیی وەڵاتەکەمان، بۆ ڕوون کردنەوەی بۆچوونی خۆی دەربارەی پێکانی ئامانج لە دیدی کەسێکی ئەکادێمیی ئاگادار لە دۆخی «کۆڕ»ەکانی هاوجۆر لە زۆربەی وەڵاتانی دونیادا و شارەزا لەوەی چۆن کۆشکێکی وەها دەتوانێ باشترین بەرهەم پێشکەش بکات.

**ئەی بارودۆخی «یەکێتیی ئەدیبان»... هیچیان لێ دەبیستیت؟**

جا ڕەخنەم لێیان چی بێت کە من هیچیان دەربارە نازانم و بەهیچ جۆرێک پەیوەندیم لەتەکیان نییە. ئەوپەڕی قسەم لێرەدا ئەوەیە من هیچ هەبوونێکیان لێ نابینم، ئەمەش ڕەخنەیەکە دەکرێ وەڵام بدرێتەوە بەوەی تاوانەکەی دەگەڕێتەوە بۆ من کە پەیوەندیی ڕاستەوخۆم بە دونیای دەوروبەرمەوە کەمە...

91- دکتور صالح أحمد العلي (1918-2003) نووسەر، تۆژەر و مێژوونووسی عارەبی عیراقی، ساڵانی (1978-2001) سەرۆکی «کۆڕی زانیاری عیراق» بوو.

**پارێزگاریی لە ئەکادێمیستان!**

**مامۆستا مەسعوود، ئەکادێمیستان بۆ بەشداری لە پێشخستنی کۆمەڵگەدا، بۆ وەها درەنگ کەوتوون؟**

مەبەستی پرسیارەکەت گشت ئەکادێمیستانە یان تەنها ئەکادێمیستانی عیراق؟ پێم وایە مەبەست تەنها عیراقە، سەرەتا دەڵیم ئەوەی ئەکادێمیستان کۆ دەکاتەوە هەر ئەوەندەیە کە چەمکی «جیوگرافیان» خەڵکی سەربەر جیوگرافیا کۆ دەکاتەوە، شێوازی تۆژینەوەیان وێکچووە، ئەویش بە ڕەچاوگرتنی جیاوازیی دەرفەت لە وەڵاتێکەوە بۆ وەڵاتێک.

دڵنیا نیم لەوەی کەسانێک هەبن لە عیراقدا دەرفەتی خۆتەرخان کردنی ئەکادێمییان بۆ ڕەخسابێت. ئەوەندەی من بزانم دەوڵەتێکی وەک عیراق کە سەروکاری لەگەڵ سیاسەت و بەرپرسایەتیی سیاسەتدا تازەیە و لە کێشەوە گلاوە، کات تێیدا خاوەخاو زۆر دەکات تا دەگاتە ئەوەی ئاوڕی جیددی بداتەوە لە ئەکادێمیستان و پەرۆشیان بێت.

ئەکادێمیستان گەر پەیدا ببن و بتوانن پەیامی خۆیان پیادە بکەن، سوودی کارەکانیان جێی ناگرێ مەگەر دەوڵەت یان لایەنی توانای پەرۆشی و سەرپەرشتی ئەو کارانە لە ئامێز بگرێت. ئەکادێمیستان خۆیان، هەر وەک ناونیشانیان ئاماژەی پێ دەدات، بەگشتی خەریکی کاری خۆیانن و هیچ توانایان نییە دەرئەنجامەکانیان بەسەر کۆمەڵگەدا بسەپێنن. جۆری کارەکەشیان وەهایە تاریکاندن پەسەند دەکات و هیچی لێ ئاشکرا ناکات. جا گەر ئەکادێمیستێکی وەڵاتی سویسرە، بەهۆی نەبوونی ڕێبەستی ماددی و یاسایی، توانی بەرهەمی خۆی بڵاو بکاتەوە ئەوا ئەکادێمیست لە ئاپۆرەی جیهانی سێیەمدا ملکەچی سەنسوورە، ئەنجامی کارەکەی بەرتاوی چۆنیەتی هەڵسەنگاندن و ئارەزووی لایەنی فەرمییە. چاوەڕێش ناکرێت ئەو بەرهەمە کاریگەریی

هەبێت مەگەر ئەوەندەی ئەو بەرژەوەندییە لای پەسەندە کە لە دیدی سیاسییەوە پەیدایە.

کەواتە گلەوگازەندە لە ئەکادێمیست ناکرێ گەر پێگەی خۆی نەگرت و نەیتوانی ویستی خۆی پیادە بکات، مەگەر هەلومەرج پێگەی بەرپرسایەتیی دابێتێ، واتە دەرفەتی دابێت کرداری سوودبەخشی هەبێت.

## ئایەندەی فەرهەنگ لە عیراقدا

**مامۆستا مەسعوود، نامانەوێت زۆر ماندووت بکەین... ئەوەی باست کرد دەربارەی فەرهەنگ جۆرە دیدێکی خەوناسایە بۆ داکەوتێکی نوێ... ئایە وێنات چییە بۆ ئایەندەی ئەم فەرهەنەگە لە عیراقدا؟**

ئایەندە دوو ئایەندەیە یەکیان نێزیک و یەکیان دوور. ئەوەی نێزیکە وێکچوونی لەگەڵ ئێستادا زۆرە چونکە وەڵاتانی شۆڕشاوی، بەپێچەوانەی دیدی باو، لە سێبەری ئەو بارودۆخەی شۆڕش وەدەستی هێناوە، دەبنە کۆنەوار. ئەمەش ڕێسایەکە لە ڕێساکانی ژیان و لە دەوروبەری خۆیشمان، هەم دوور و هەم نێزیک، نموونە زۆرن.

هەرچی دووری بەردیدە، نەک کۆتای سەدەی داهاتوو، ئەوا دیدە دێرگەلێک دەخوێنێتەوە وەک ئەوەی فاڵگرەوە و قاوەگرەوە لە فنجاندا دەیبینن. ئەویش تێکەڵەیەکە لە فەرهەنگی سەردەم لەگەڵ نیشتەی بەهێز لە کەلەپوور و فەرهەنگی عارەبی. سروشتی هێزی کەلەپووری عارەب و ئیسلام وەهای لێ دەکات زیاتر پەلکێش و پەرۆشی ڕابردوو بێت. لەبەر ئەمەش پێویستی هەیە بە خۆچەکدار کردن بە مەبەستی بەرەنگاربوونەوەی تەوژمی تازەکاری.

ئەم تەوژمی تازەکارییەش بە لای خۆیەوە لێرە بەهێزترە وەک لە وەڵاتێک میراتی بەرزی کەمتر بێت، چاوەڕوانیش هەیە لە کۆتادا ئاگربەستێک بێتە کایەوە. لە ڕاستیشدا بەرەنگابوونەوەی تازەکاری بۆ تەوژمی کۆنەوار درەنگ کەوت بە بەراورد لەگەڵ ئەوەی سەردەمی عەبباسی ڕوویدا، ئەو دەمە شەپۆلی فەرهەنگی تەرجەمەکراوە لە ماوەیەکی کورتدا وەها باڵی کێشا دینناسان ناچاربوون لێکدانەوەی وەها بۆ دەقی سەربە باوەڕ دارێژن بگونجێ لەگەڵ ئاماژەکانی زانستی تەرجەمەکراو. هۆکاریش پێم وایە دوان بوون:

هۆکاری یەکەم ئەوەیە خەلیفەکانی عەبباسی لە دەستەی ڕێبەرانی دینی نەبوون بگرە بە پێوەری ورد لە دونیاوە نێزیکتر بوون، ئەمان بە یارمەتیدانی زانیاری هاوردە شەرمەزاری نەیدەگرتن.

هۆکاری دووەمیش ئەوەیە گورجیی فەرهەنگی هاوچەرخ لە عیراقی ئەم سەردەمەدا نەگیشتۆتە ئەو گورجییەی لەو سەردەمەدا هەیبوو، تا ئەو ڕادەیەی نابینیت مامۆستایانی دینی ئەم زەمانە بەپێویستی بزانن پەنا بەرنە بەر لێکدانەوەیەکی تازە، گونجاوی سەردەم بێت...

زۆرینەی ڕووناکبیرانمان هێشتا لە دەروازەی ژیار و فەرهەنگی نوێدا ڕاوەستاون، هێشتا نەیانتوانیوە پەی بەرن بە ڕەهەندەکانی پەیدۆزییە زانستییەکان لە مەیدانی فیزیا، گەردووناسی و جۆری نوێ لە زانیاری سەربە ژیان و گیان، هۆش لێیان سەرسام دەمێنێ و لە نێو نیگادۆزیی[92] ئایەندەدا بزر دەبێ.

لەوانەیشە کات هێندە بەسەر چووبێت کە ڕۆشنبیری عیراقی بەڕاستی هەست بە نیگەرانی بکات بۆ زانینی دوا ئەنجامی شیمانەی ئەو هەموو

92- نیگادۆزی: إستشراف Prospecting

زانسته ڕکابەرە لەسەر دیاری کردنی پێناسەی «ڕاستینە»ی ئەم بوونە.

چەند کەسێک کەمژمار نەبێت نەمدیوە کەس پەرۆشی ئەم بەرەژانە زانستییانە بێت کە کاریگەریی دووریان هەیە لەسەر داڕشتنی دیدێکی زانستییانەی بێ ترس و بێ خەم.

«...»

**ڕاستە لە گفتوگۆی بیرمەند مەسعوود محەمەد گەیشتینە کۆتا، بەڵام دڵنیاین ساتێکی دیکە پێی دەگەینەوە، بگرە لە دونیا بەرینەکەی خۆیدا پێی دەگەینەوە و باسی بیرۆکە تازە و تازەکارەی خۆیمان بۆ دەگێڕێتەوە، بەڵگە و ئاکامگیریمان دەداتێ، هەر جارێک دۆخی فەرهەنگ و ئەدەب لە نێوانماندا گۆڕانکاری بەسەردا هات، و هەر جارێک ببینێت ئەم فەرهەنگە لە هەڵوێستێکیەوە سەر دەکات مەیلی چاکەخوازی و پێشکەوتن لە مرۆڤدا دابین دەکات، نیشتیمانێک دڵاسوودە دەکات و لە ئەڤین و هەڵکردن و گەشانەوەدا باڵا دەکات. مەسعوود هێشتا لە گەردمان ئاڵاوە، بۆ گۆڕانکاریی هزر و ئازادی دەگەڕێ.**

«...»

## نووسەر، نووسین و ئازادی[93]

93- «نووسەر، نووسین و ئازادی»، مەسعوود محەمەد، تەرجەمەی لە عارەبییەوە سایتی مامۆستا www.mamosta.net ستۆکهۆلم پاییزی 2013

ئەم بەرهەمە دەستنووسێکە بە زمانی عارەبی بریتییە لە 27 پرسیار بەڵام بەداخەوە پرسیارەکانی 25 ,24 ,23 ,20 ,19 ,14 بزرن. ئەو 21 پرسیارەی ماون لێرەدا لە ژێر سەردێڕی «نووسەر، نووسین و ئازادی» تەرجەمەی کوردی کراون. سەرلەبەری پەراوێزەکان زادەی ئەم تەرجەمەیەن.

### 1) ده خاڵ ڕاگەیەنی فەلسەفەی نووسینت بن؟

1. نووسین بەلای منەوە تێکەڵەیەکە لە هزر، هونەر، وابەستەبوون، ڕەوایەتی (شایەستەتی)[94] لە هەناوی دەروووندا هەڵدێت هەتا بە پێگەیشتن و ڕسکان وەک مەلۆتکەیەکی تەواو ئافرێندراو دەگاتە گشتەیەکی تێکبەستە و داوای زان دەکات.
2. هەر کەماسییەک لە پەیکەر و لە ئاوازی نووسیندا دەبێتە ڕەنگدانەوەی کەماسییەکی هزر، هونەر یان باوەڕ بە وابەستەبوون و شایەنبوون کە دەمی هەڵهاتنیان لە کاسەی هەناودا بە هۆی درزێکی نێو پێکهاتەکانی دروستایی، پەیدا بووە.
3. نووسین بەرانبەر گوتن شکۆی باڵاترە چونکە، گەر هاتە سەر گەواهی لە سەردەم ئەمیان ڕاستگۆترە، بۆ دەربڕین لە ڕەوانی خاوەنەکەی ڕەوانترە، بۆ گەیاندن بە خەڵک ڕاگەیەنترە. بەروبوومی ئەزموونی نووسین تەژیترە[95]، ڕیشەدۆزیی پەنهان لای ئەمیان ڕۆچووترە، پێکهاتەی دروستترە و بۆ ئایەندەش هەر ئەمیان پەیامبەرێکی سەرامەدە.
4. بۆ نەخشاندنی تابلۆی ژیار، نووسین لە هەموو دەستاوێژەکانی دیکەی شێوەکاری پتر توانایە و بۆ ڕێبازەکانی ئاکار لە گشت چراکان ڕۆشنترە.
5. نووسین، چونکە فرە کاریگەرە، گەر خزی لە گشت جۆرە ژەهری کوشندە پتر زیانبەخشە، لەبەر ئەوە نووسەری فریودەر بەدترین

---

94- «ڕەوایەتی» بەرانبەر «حق» و «شایەستەتی» بەرانبەر «إستحقاق» دانراون.

95- «تەژی»: تێری و خۆشی - بڕوانە مەسعوود محەمەد، «زاراوەسازیی پێوانە»، لاپەڕە 161. سایتی مامۆستا: www.mamosta.net

دوژمنی مرۆڤە. گوتار تاکەتاکە بیسەری هەیە، نووسین هەزاران خوێنەر.

6. هونەرگەلی پێسەلماندن[96] لە نووسیندا کۆتا نابن، شێوازەکانی سنووردار نابن، جوانییەکانی بەربەست نابن، نووسەر هەر جوانییەک بێنێتە بەرهەم هێشتا جوانتری لەدەست دێ.
7. نووسین لایەنی کەم دەبێتە خوێی نێو خۆراکی ژیار.
8. خامە تۆپهاوێژێکی شەستتیرە زەخیرەی وشەی تەواو نابێ گەر ئاڕاستەی نارەوایی کرا لە مووشەک باشتر دەیرمێنێ. لە ئاست ڕەوایەتیشدا هەر وەهایە. وەی لە شەرمەزاریی نووسەری درۆزن.
9. خامەی دەستت وەک سەری مارە، گەر مەرەکەبی لێ نەچۆڕێت، ژەهر دەتکێنێ و لەوانەیە لە خۆت هەڵگەڕێتەوە.
10. بێ زیادەڕۆیی، هەر جار نووسینێکی نوێم لە نێو خەڵکدا پەخشان دەبێ، هەستێکی خەست بە ژینێکی کەڵەکەبوو تێمدا دروست دەبێ. هەست دەکەم زاتی من دەگاتە زاتی هەر خوێنەرێکی بە باشی تێم دەگات و دەجەنگم بەرانبەر دزێوی لە هەر خوێنەرێکدا بیانوو هەڵبەستێ بۆ دوژمنایەتیی ڕەوایەتییەکی من نووسیومە. ئەی خامەکەم: لەگەڵ هەموو دەردی بارودۆخ، لە وەشاندنی وشە بەسەر کاخەزدا، زمانێکی ڕاستگۆ بوویت بۆم. ئەمانەتەکەمان شکۆمەندانە و سەروەرانە هەتا ئەم ڕۆژگارە گرتۆتە ئەستۆ. مێرگێکی جوانمان بە گوڵی هونەر، بەری هزر، گەشەندی دۆستایەتی و هەوری سروش چاندوە، دەیسا مادام زمانت تەڕایی مەرەکەبی هەیە بەردەوام بە لە کێڵان و تۆو کردن و بەرگرتن، چونکە لە نێو ئەم پەنجەگەلەی لەتەک تۆدا ڕێبازی خێر، جوانی و ڕەوایەتییان گرتۆتە بەر، شکەست ناهێنیت.

---

96- «پێسەلماندن»: «إقناع».

## 2) خوێنەرانی تۆ کێن؟

خوێنەران گەر هەبن دەبێ لە ڕۆشنبیرانی سەروو ئاستی مامناوەند بن چونکە من خۆراکێک پێشکەش ناکەم هەرسی ئاسان بێ، ئەوەی ئاسانە هیچی نوێی تێدا نییە، دووبارەی دووپاتە. گوتاری منیش لە بنەڕەتدا بۆ مێشکی فرەوانی ڕیشەدۆزە بە هیوای ئەوەی توانایان بۆ سوودوەرگرتن لە خۆراکی سەنگین ببێتە پردێک بۆ پەڕینەوەی بیروڕاکانم بۆ فێرخواز و خوازیار و لەوانیشەوە بەرهەمەکەی بگاتە وەڵاتییەک پێویستی پێی هەیە چونکە بێسوودە مرۆڤ باوەڕ بهێنێ بەوەی خەڵکی بازاڕ و کێڵگە دەخوێننەوە و لە بەرهەمی سەخت تێدەگەن. ئەمەی دەیڵێم لای خۆم بەرهەستە چونکە دەبینم کەسانی سەرتەڵ لە نووسینم دەگەڕێن و دیدارم لەگەڵ زۆربەشیاندا یەکەم دیدارە و هەر لەوێشدا هەڵوێستی جوان دێتە کایەوە خۆشیهێنە کە دەبینم کەسانی پایەدار، کە زووتر نەمناسیوون، گرینگییەکی سەروو ئاسایی پێشان دەدەن. بەڵام ئەمە نەبۆتە بەربەست لەوەی نووسینەکانم زایەڵەیان لە نێو خەڵکی مامناوەند و بەرەژێرتریش پەیدا بێ، گەرچی تێگەیشتن لێیان سەختە.

ئەرکی خوێنەری کورد لە دەرک کردنی نووسینی کوردیم سووکترە چونکە من لای زۆربەیان ناسراوم و لەوانەیشە هەر ئەوە بێ هۆکاری ئەو هەستیارییەی لای دەستەیەک نووسەری کوردی ناسراو دژ بە من هەیە. هەستیاریی لەو بابەتە هەرگیز لە خوێنەر، نووسەر، بیرمەند یان هونەرمەندی عارەبەوە ڕووبەڕووی من نەبۆتەوە، دەشێ بەلایانەوە مێوانێک بم بە خۆراکی خۆمەوە ڕووم لە دیوەخانیان کردبێ. میواننەوازیی ئەوان زۆر جار بۆ من زیادەڕۆییەکی گەورەی تێدا بووە، ئەویشم لەبەرچاوە.

بەڵام باسی کوردی ڕەوەندەی ئەورووپا و کوردی کوردستانی ئێران باسێکی تەواو جودایە. ئەوان بەرانبەر من نیازپاک و دڵگەشن، هەست و سڵاویان دەمگاتێ، جارێک دەماوەدەم و بارێک بە نووسین. لە سوێدەوە کوردێکی بەرچاوی کۆمیونیست بیرەوەرییەکانی خۆی لەگەڵ پێشکەشنامەیەکی ناسکدا ناردووە بۆم. بەرپرسێکی کۆمیونیستی کوردی عیراقی کە زووتریش بە قسە لێمی پرسیووەتەوە، لە سوێدەوە بە سۆزەوە دەربارەی منی نووسیەوە. کەسی دیکەش داوای کتێبەکانی خۆمیان لێ کردووم هەتا ئەوەی بەشێکیان لام نەماون. بازاڕم لە نێو ڕۆژاواییەکاندا نییە بەڵام بەشە عارەبییەکەی ڕادیۆی لەندەن جارێک، بەر لە ساڵێک، گوتی نامەکەم «بۆ گۆرباچۆڤی مەزن» تەرجەمەی ڕووسی و ئینگلیزی کراوە - و بەقسەی چەند دۆستێک - کورتەیەکیشی دەربارەی ژیانم پێشکەش کردووە. خوێنەری عارەبی دەرەوەی عیراقیشم دەگمەنن و نایەنە بەرباس.

گوتەیەکیشم هەیە بۆ سەرجەمی ئەم باسە: بیست ساڵێک بەر لە ئێستە کاتێک دەستم دایە نووسینی بەردەوام، مژاری هەڵوێستی خەڵک بەرانبەر بە خۆم، لە مێشک و ئاواتی خۆم وەدەر نا. چونکە دەمزانی نووسینی من کە دژەو تەوژمە نە زانی ئاسانە و نە بەرتەکی برایانە پەیدا دەکات. بە هەر مەیدانێکی نووسیندا ڕۆیشتبم بەرەنگاری باوەڕی باو بوومەتەوە. وەنەبێ لە سروشتی مرۆڤ بێ ئاگا بووبم، دەزانم لە دژایەتیدا گورجترن و بۆ نکووڵی ڕژدترن وەک لە بۆ دۆستایەتی و ڕۆشەن کردنەوەی چرا، دووریش نییە چرا بگۆڕنەوە بە بۆمبا. لە دژایەتیی یەک لایەنەدا هێندە زیادەڕۆییان کرد گەیشتن بە شکاتی درۆ و هەڵبەستنی وەها کە زادەی ڕسواییە. بەڵام من تەنها ئەوەم کرد کە لێم چاوەنۆڕ دەکرێ و هیچی دیکە، خۆم بە سەلماندنی نەهامەت ڕام کرد و ئەو پێگەیم بۆ نەیارانم سەلماند کە خۆیان بۆ خۆیان هەڵبژارد.

### 3) مەودای پێوەربوونی[97] بیروڕاکانت چەندە؟

بیستوومەتەوە کوردێکی سوێد لەگەڵ کوردی وەڵاتێکی دیکە دەئاخوێ و دەڵێ تەماشای ڕووداوەکانی سۆڤیەت دەکات و کتێبی مەسعوود محەمەدی بە تەنیشتەوەیە، هەر دەڵێی بەو تەماشا کردنە کتێبەکان بەسەر دەکاتەوە...

بیروڕاکانم نە پەرجوون[98] و نە دۆزینەوەی تەنها خۆمن، دەکرێ زۆر کەس پێیان بگات یان لێیان نێزیک بێتەوە گەر وەک من خۆی لە سەلمێنە هزرییەکان دابڕێ و بابەتیانە لە بابەت و هۆکار ورد بێتەوە، گەر بە سەلماندن یا بە ئەزموون جێگیر بوون، چ ماددی بن چ نامادی، چ ئابووری بن چ قسەی زیادە و بێسەروبەر، بسەلمێنێ. مرۆڤ گەر ئەو دیاردەگەلەی ئاشکرا دەبن لە سروشتی بابەتی وەک سیاسەت، ئابووری، غەیب، ئەستێرەناسی، دەروونناسی و چەمکی دیکەی هاوجۆر، بسەلمێنێ، بینەریش گەر هەیبێت هۆشێکی ناتەنبەڵ، کۆمپیوتەرێکی نێوخۆی ناخاو، کاتێکی درێژخایەنی ڕامان و سەبر بە دیار چاوەنۆڕیی دەرئەنجامەوە، ئەوا دڵنیام لەوەی داهاتی لە ماوەی بیست سی ساڵدا دەبێتە خەرمانێک لە بەروبوومی هزریی وەها لەتەک ڕاستیدا ئەوەندە هاوئاهەنگ بێ ببێتە مایەی شانازی.

پێم وایە خەریکبوون بە دارِشتنی نەخشەی گەردوون، هەم پارچەکانی هاوئاواز بن و هەم ئەوەندەش نەرمەکار بێت بە دۆزینەوەی نوێی پەیدۆزیی تەنگاو نەبێت، یاریدەری مرۆڤ دەدات بە پلەی یەکەم گرینگیی بداتە ئەو بابەتەی شایانی گرینگییە، سەرنج بداتە هەر

---

97- «پێوەربوون» بەرانبەر «إنتشار» ە کە بڵاوبوونەوەی بە پلان و ئامانجە نەک ڕەمەکی - بڕوانە «زاراوەسازیی پێوانە»، لاپەڕە 90.

98- «پەرجوو»: «معجزة».

دیاردەیەکی سەرنج ڕادەکێشێ بۆ ڕاهێنانی هەستەوەرەکانی بەمەبەستی دەرک کردنی دیاردەی پەنهان گەرچی نارِوون و تەماوی بن. لە پلەی دووەمدا پێیدا دێتەوە لە شێوەی خەملاندن، نرخاندن و بەراوردکاریی وەها بەناچاری بگونجێ لەگەڵ هاوئاوازیی پارچەکانی نەخشە خەیاڵزادەکەی خۆیدا، ئەوجا گەر تووشی دیاردەیەک هات جێی تەرخانی لە نەخشەکەدا نەبێ ناچێ بە وێڵ کردن و بێباکی خۆی لێ لادات، چونکە هەر لە سەرەتاوە ئامادەیە بۆ سەرنجدانی بابەت و بۆ شرۆڤەکاری نەک بۆ نەخشە هەڵواسین. فەرموو لەگەڵ ئەم نموونەیەدا: سوورپێستەکانی ئەمریکای باشوور و گشت ئەو هەرێمەی ئەمرِۆ دەوڵەتی مەکسیکە، چەندین سەدەی بەر لە دۆزینەوەیان لە لایەن کریستۆفەر کۆلۆمبۆس - ـەوە خاوەن شار و دەوڵەتان بوون، پاشان توانییان تێکەڵ بە ئەورووپییەکان ببن و خێزانیان لەگەڵ پێک بێنن. لەم تێکەڵبوونە مولاتۆ[99] پەیدا بوو کە پێی دەڵێن «مەسیزۆ» *Mestizo* بە ژمارەش ڕێژەیان بەرزە. هەرچی سوورپێستی USA و کەنەدایە نە شاریان پێ ساز بوو نە حکوومەتیان دامەزراند و هەر لە ئاست گوند و خێڵدا مانەوە و پاشانیش نەیانتوانی ئاوێتەی ئەورووپییەکان ببن مەگەر دەگمەنێکی دەگمەن. دەبێ نهێنی ئەم دیاردەیە چی بێ کە دەشزانین کەش و هەوای USA بۆ فراژووتن لەبارترە؟ من وەڵامی ئەم پرسیارە نازانم، ڕوو دەکەمە خەڵک و دەبینم پرسیارەکە بەخەیاڵیاندا نەهاتووە.

کاتێک دەست دەدەمە نووسین، دڵنیابوون لە دروستیی نووسینەکەم دەکەمە سەرشار، بەوەش نووسین بە گەرمیی ویژدانمەوە ڕێچکە سەر

---

99- «مولاتۆ»: مرۆڤی دوورِەگە - بۆ نموونە دایکی سپی و بابی ڕەشپێست بێت، ئەمیان ئەورووپی و ئەویان سوورپێست بێت. وشەکە سپانییە Mulato، بە ئینگلیزی دەبێتە Mulatto و بە عارەبیش: «خلاسي».

دەکات و ئامادەش دەبێت بۆ دروستبینی لە بابەتەکی خۆیدا. پێشم وایە هەر ئەمەیە خوێنەر بۆ لای من ڕادەکێشێ.

### 4) بۆ کێ دەنووسیت، بۆ؟

من بۆ گشت مرۆڤایەتی دەنووسم بەڵام بە زمانێک گشت مرۆڤایەتی تێی ناگات و بەستێنی بڵابوونەوەی ناگاتە یەک لە پەنجا هەزاری کۆی مرۆڤایەتی. دەرئەنجام دەکاتەوە ئەوەی من بەکردەوە بۆ کەسانێک دەنووسم کە تێم دەگەن، واتە کورد و عارەب. ناکرێ ئەوەشم لێ بکرێتە ڕەخنە گۆیا ماکی ئەوەی بۆ گشت مرۆڤایەتی دەنووسرێ ناشێ بۆ بەرژەوەندیی ئەو دوو گەلە پیادە بکرێ، چونکە من لایەنگری «ڕەوایەتی»م و ڕەوایەتیش بەگشتی ها وەلای لاوازەوە، جا گەر بەهێز لە بازنەی پەرۆشیی من دەرچوو دەبێ چی کەوتۆتە نێوانمان لە خۆی ڕاتەکێنێ. بەشێکیش لە ڕێکەوتە بەدەکان ئەوەیە کورد دەکەوێتە خانەی لاوازەکان، پارەکراوی بێپشتیوان، بەوەش تەرازووی ڕێک نابێتەوە کە لە منەوە پەرۆشیی زیاتر بەر دەکەوێت، ئەوەتا عارەب لە «نەتەوە یەکگرتووەکان» دا خاوەن بیستویەک ئاڵای شەکاوەیە کەچی دونیا بە یەک ئاڵای داخوراو بۆ کورد هەراسان دەبێ. هەرگیز نەشهاتووم کورد هان بدەم بۆ سەرکێشیی بێهودە، پەسنی شۆڕشگێڕی و چەپڕەویی پەڕگیریشم لە کەسدا نەکردووە، بگرە درووژاندنی دزێو، خۆبەزلزانیی گەوجانە و توندوتیژیی شێتانەی نێو خەڵکم بەگشتی سەرزەنشت کردووە. خۆم لە پەسنی وڕێنەکانی شۆڕشی فرەنسی دوور ڕاگرتووە گەرچی لە سەرانسەری جیهاندا بۆ خەباتی خەباتکاران بۆتە نموونە.

من لایەنگری ڕەوایەتیم ئەوجا گەر هۆکاری دژواری توانابەدەر لێی بوونە بەربەست، ئامۆژگاریم سەبری باڵا و خۆئامادە کردنی ژیرانە

بووە، خۆ لادان بووە لە بەفیڕۆ دانی ڕەوایەتیی دیکەش، چونکە داوای ڕەوایەتیی ڕێتێنەچوو[100] وەک داوای ترێیە لە دارمێوی زستان.

بێباک نیم لەوەی دیاردەی چەوت و هەڵە ژماربەدەرن و ناکرێ وەک پێویست لێیان بدوێم، وەی چەند دژوارە مرۆڤ ببینێ ستەمکارێک، چەوتێک یان گۆمڕایەک شاناز و ڤەکری ئارەزووی خۆی پیادە بکا بەڵام ڕێ لە کەسی ژێر بگیرێ لاری لێی هەبێ چ جای بەرەنگاری بێتەوە. جار هەیە دەکرێ لە بازنەی کەسانی جێباوەڕدا باس لە نارەوایەتی بکرێ بەڵام دەرفەتی نووسین دەربارەیان بەستراوە، بەوەش لەسەر دڵ کەڵەکە دەکەن و هەناسە پێیان تەنگ دەبێ.
«مەعەرری»[101] لە دۆخێکی وەها دەڵێ:

تلوا باطلا و جلوا صارما
وقالوا صدقنا فقلنا نعم

نارەوایان گوت و دابڕیان نواند
گوتیان ڕاستمان فەرموو، گوتمان ئەرێ

ئەم وشەی «نعم» ـەی کۆتای دێڕ یان بۆ کێشی هۆنراوەیە یان بۆ پێشاندنی بارودۆخی ئاپۆرەی خەڵک چونکە «مەعەرری» خۆی بە ئاسانی «نعم» ی نەدەگوت بۆ سەلماندنی نارەوا. منیش دەڵێم کەسی دادپەروەر گەر نەتوانێ لاری هەبێ بەسیەتی بێدەنگ بێ لە سەلماندن.

---

[100]- «ڕێتێنەچوو»: «مستحيل» - پێشنیازی کاک ڕێبوار کەریمی.

101- أبو العلاء المعري (973-1057) شاعیر و بیرمەندی ئەدەبی عارەبییە، لە سەردەمی عەبباسیدا ژیاوە و خاوەن چەندین شاکارە، هەرە ناوداریان «رسالة الغفران» ـە.

## 5) گرینگیی ئازادیی بۆ نووسەر و بۆ بیرمەند؟

ئازادیی گرینگە بۆ گشت کەسێک و لە بنەڕەتیشدا مافێکی خۆڕسکە هەم تاک و هەم کۆ بێ فەلسەفە پەیڕەوی دەکەن، گیانەوەرانیش بێ ڕێسابەندی پیادەی دەکەن مەگەر ئەوەندەی بەند بێ بە ترس و تەمای ژیانەوە. پرسیارەکەش بەوەی جیاوازی دەخاتە نێوان نووسەر و بیرمەندەوە بە لای منەوە ڕەهەندێکی ناخوازیار پەیدا دەکات، کێیە ئەو نووسەرەی دەبێ جودا بکرێتەوە لە بیرمەند؟ نووسەرێکی سیاسی، ئابووری، هونەری، سەربازی، ڕەخنەگر، نووسەری خوازنامە[102]، خامەداری دادگە[103]؟ ئەوجا پرسیارێکی دیکە بە واتاکێشەکێ[104] خۆی ڕەپێش دەخات: ئایە نووسینی نووسەر پەیوەندی بچڕاوە لەگەڵ هزر؟ ئایە بیرمەند بەبێ نووسینی پەخشانکراو بیر دەکاتەوە؟

دەبا پرسیارەکە بەو شێوازەی خۆی جێبهێڵین و هێندە شەرمەندەی نەکەین بە زێدە وردەکاریی لە واتای شێوازەکەی. لەم گۆشەنیگایەوە نووسەر جودا دەکرێتەوە لە بیرمەند بەوەی نووسەر دەبێ بنووسێ و بڵاو بکاتەوە بەڵام بیرمەند دەشێ ساڵێک یان زیاتر هیچ بڵاو نەکاتەوە. کەواتە پێویستی نووسەر بۆ ئازادیی ناچارییە، بەردەوامە و ڕۆژانەیە. ئەمە لە ڕووی شێوازەوە بەڵام نێوەڕۆک، چی و چۆن دەنووسێ، ئەوا لێرەدا پێویستی بە دوو جۆر ئازادییە: ئازادیی دەربڕینی ئەوەی بڕوای پێی هەیە و ئازادیی دەستراگەیشتن بە پەخشانکراوەکانی دونیا. لێرەشدا لەگەڵ بیرمەند یەک دەگرنەوە لەوەی پێویستیان بە

---

102- خوازنامە: عريضة. بڕوانە «زاراوەسازیی پێوانە»، لاپەڕە 233.

103- خامەداری دادگە: نووسەری یەکەمی دادگە.

104- واتاکێشەکێ: تداعي المعاني - بڕوانە «زاراوەسازیی پێوانە»، لاپەڕە 34.

ئازادییە فرەوانەکە هەیە گەرچی بیرمەند لە نووسەر زیادتر پێویستی بە ئازادیی ڕەها هەیە چونکە هزر ڕێکگوشین[105] هەڵناگرێ و بابەتەکانی سنووربەدەرن و هەمووشیان پێکوەردەبن[106] و یەکتر دەبڕن، تۆژینەوەی ئەدەبی ناتوانێ ئەنجام بدات گەر ڕێ نەبێ بیروڕای دینی، سیستەمی جڤاکی یان فەلسەفەی فەرمانڕەوایی بخاتە بەر گفتوگۆ.

لە نووسیندا بۆم ڕوون بۆتەوە کە دوودڵی لە باس کردنی چەند بابەتێک سەری ناوە بە وشکبوونی سەرچاوەی بیرمەوە لەبەر ئەوە بڕیارم داوە بە ویستی خۆم بنووسم و جێی بهێڵم بۆ سەنسوور بە ویستی خۆی لێی ببڕێ. لەوەشدا بەسەرهاتی خەندەهێنم دیتوە، بابای چاودێر گشت باسە گەوهەرییەکانی یەک لە کتێبەکانمی وەلا نا و پێگیری کرد لەسەر ڕەش کردنەوە یەک دوو دێڕ باسیان لە بارودۆخی هەمەجۆری «هاڕوون ئەلڕەشید»[107] دەکرد. ئەو سەرکەوت و ناچار بووم «هاڕوون ئەلڕەشید» بگۆڕم بە «ئەسکەندەر مەکەدۆنی»[108] یان هەر جنۆکەیەکی دیکەی مێژوو. بەوەش چاودێر ئاسوودە ما و مەسعوود محەمەدیش هەراسان نەبوو.

---

105- ڕێکگوشین: تحجیم - بڕوانە: مەسعوود محەمەد، «لە پەرۆشەکانی ژیان». لاپەڕە 74، سایتی مامۆستا: www.mamosta.net

106- پێکوەربوون: إشتباک. - بڕوانە «زاراوەسازیی پێوانە»، لاپەڕە 324.

107- هاڕوون ئەلڕەشید: هارون الرشید (763-809) پێنجەم خەلیفەی عەبباسی (786-809).

108- ئەسکەندەر مەکەدۆنی Alexander III of Macedon (Alexander the Great) (356-323 BC) یەکێکە لە داگیرکارە ناودارەکانی مێژوو. لە شاری پەللا-ی مەکەدۆنیا زا و لە بابیل-ی مەسۆپۆتامیا سەری نایەوە. ئەسکەندەر پاش مردنی باوکی، ساڵی 336 ی پێش زایین تاجی پاشایەتیی مەکەدۆنیا

لە ڕاستیدا پێویستیی خەڵک بۆ ئازادیی بەهرەدارانی خۆی کەمتر نییە لە پێویستیی بەهرەداران خۆیان بگرە پێویستیی خەڵک زیادترە چونکە ڕەسەنایەتیی بیروڕا کە زادەی ئازادیی دەربڕینە سوودی بۆ گشت خەڵک دەبێ. تەنانەت دەسەڵاتیش لەم باسە بەدەر نییە، چونکە دەسەڵات گەوەکی[109] ژیانە لە کۆمەڵگەدا پێویستی بە ڕای خاوەن ڕایانە بە پێداگریی زۆریشەوە. لێرەدا نموونەیەک دەهێنمەوە:

حکوومەتی میسر لە کۆتای بیستەکان یان سەرەتای سییەکان لەگەڵ بریتانیا دەربارەی چەند دۆزێک پێک هات و دەقی پێکهاتنەکە پەخشان کرا و خەڵکی پێیان باش بوو، بەڵام یاساناسێکی نەخۆشی خانەنشین لە نووسینێکدا چەند خاڵێکی نادیاری ئاشکرا کرد کە زۆر زیانبەخش بوون، بەوەش هەم حکوومەت و هەم خەڵک لێیان هۆشیاربوونەوە و ڕێککەوتنەکە شکەستی هێنا. «ئەحمەد شەوقی»[110] لە هۆنراوەیەکدا پەسنی ئەم یاساناسە بلیمەتە دەکات، دوو دێڕێم لەبەرن باس لە نەخۆشییەکەی دەکەن:

ارتدت العاهات عن اخلاقه
لسموهن وحلت الاعظاء

---

لەسەر نا. ئەسکەندەر جەنگێکی گەورەی دژ بە ئیمپەراتۆریی هەخامەنشی هەڵگیرساند و ساڵی 331 ی پێش زایین لە شەڕی گەوگەمیلا Battle of Gaugamela ی دەشتی هەولێر دارای هەخامەنشیی شکاند و دەوڵەتی هەخامەنشی کۆتای هات. ئەسکەندەر میسر و ئێرانی ئەو سەردەمەی داگیر کرد و گەیشتە وەڵاتی هیندستان. داگیرکاریی ئەسکەندەر بۆ ڕۆژهەڵات دیاردەی فەرهەنگی هێلێنیزمی لێ بەرهەم هات.

109- گەوەک: لولب.

110- أحمد شوقي (1932-1868) لە ئەدەبی عارەبیدا خاوەن نازناوی «میری شاعیران - أمیر الشعراء» ـە.

عطفته عطف القوس يوم رماية
وثنته كالماضي فزاد مظاء

له ئاست ئاكاری چونکه بەرز بوون،
کەماسییەکان گەڕانەوە و پەلوپۆیان گرتەوە

وەک کەوانەی ڕۆژی تیرهاوێشتن چەمکارە
وەک شمشێری دەمتیژ چەمکێشە و کاراتر هات[111]

گشتیان بەر میهرەبانی خودا بکەون، هەم میری شیعر و کەسی پەسنکراو، هەم ئەندامانی ئەو حکوومەتەی ئامۆژگارییەکەیان سەلماند.

### 6) له جۆرەکانی نووسین کامیان بۆ کۆمەڵگەی ئێمە دەست دەدەن؟

جڤاکی ئێمە گەر بەراورد بکرێ بەو جڤاکانەی مەودایەکی بەرینیان لە ژیاردا بڕیوە، سەرەتاییە، جا ئەگەر هاتین و ئاستی ڕۆشنبیریی خەڵکمان ڕەچاو گرت بۆ ئەوەی خۆراکێکی بدەینێ بۆی هەرس بکرێت ئەوا زیان لە خۆمان دەدەین چونکە ئاستە ڕۆشنبیرییە بەرزە کەمژمارەکان وێڵ دەکەین. ئەگەر جەخت تەنها لەسەر ئاستە باڵاکان بکەین ئەوا بەشی ئەوانەی دیکە کەم دەهێنێت، کەواتە پێویستمان بە هەمەڕەنگی هەیە بۆ ئەوەی هەر کەس پێویستیی خۆی بدۆزێتەوە بەڵام نەگاتە ڕسوایی. هەر چۆنێک بێ ئەم کارە ئاسان نییە چونکە کەس بۆی نییە بڕیار بدا بۆچوونی کەسانی دیکە وێڵ یان بەربەست

111- چەمکار و چەمکێش بەرانبەر «تقوس، إنعطاف، إنثناء» هاتووە - بۆ چەمکار و چەمکێش بڕوانە «زاراوەسازیی پێوانە»، لاپەڕە 106.

بکرێت، چ ڕێبازێکی ئامادەش نابینم بۆ سەلماندنی باش و لادانی خراپ، ئەوەتا لە گشت بوارێکدا سەنسووری فەرمی هەیە بڕیار دەدا چی پەخشان بکرێت و چی نەکرێت تا ئەوەی گەورەترین فەیلەسووف و زانای وەڵاتەکە بەرتاوی فەرمانی کەسانێکە بە شاگردی خۆی ناشێن. ئەمەش هەلومەرجی سەنسوورە لە هەر کوێیەک هەبێت.

بە ڕای من، بەگشتی، ئازادیی لە تەسکاندن باشترە. لە بەرنامە فەرمییەکانی خوێندندا نووسینی وەها دەبینم هیچ لۆژیکێک نایسەلمێنێ بەڵام ڕێک هاتووە لەگەڵ ئارەزووی کەسی بڕیاردەر. نە ئەم سەلمێندراوە باشە و نە بژارە ڕەتکراوەکەی خراپە. هەر چۆنێک بێ، گەر ئاسانکاریش بکرێت بۆ بەربەست کردنی خوێندنەوەی ئاستە نزمەکان ئەوا تەسکاندنی ئاسۆگەلی بەرین، ڕۆشنبیریی سەنگین، بەروبوومی هۆش لە کۆتا و دەستپێکی سەدەدا هەرگیزاو هەرگیز دروست نییە. چی دی دونیا ناتوانی خۆی ڕاگرێ نە بەسەر نوێڵ و ڕاگیرە[112] و ڕووبەری لارەوە، نە بەسەر چیرۆکەکانی «سیندیباد» و «حەسەنە زۆرزان» ـەوە و نە بەسەر سەلمێنەگەلی دەستەی جۆراوجۆر خۆیانی پێ دەخڵافێنن. ئێمە لە پەروایێزی سەردەمێکدا دەژین خەریکی ئاسمانگەردی و ماکدۆزی[113] ژینە، ئەوەتا مەودای نێوان ئێمە و زانست و تەکنیک بە ڕێژەی ئەندازەیی فرەوان دەبێت. ئێمە پێویستمان بە خۆداماڵینە لە گیانی «عەنتەرە بن ئەلشەدداد» و خۆ پۆشینە بە گیانی ئافرێنەری سەردەم، بۆ ئێمە چ سوودێکی نییە بە دراوی سووک و سەنگین بەروبوومی زانست و تەکنیک هاوردە

---

112- «نوێڵ و ڕاگیرە» بەرانبەر «عتلة وعضادة» Lever & Fulcrum هاتوون. بۆ «نوێڵ» بڕوانە جەمال نەبەز، *«سەرەتای میکانیک و خۆماڵەکانی ماددە»*، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا 1960.

113- ماکدۆزی: إستکناه.

بکەین، بەڵکوو دەبێ بە سینگەخشکە گەر نەڵێم بە هەڵەداوان پەلە بکەین بۆ دەرک کردن و دروست کردنی ئەو بەروبوومە، تەنانەت لەمەشدا هاوردنی مەکینە چ سوودێکی نابێ، بەڵکوو دەبێ ئەو زانستە پەیدا بکەین کە بنەمای ئەو پیشەسازییەیە. لێرەدا بیرۆکەیەک دەخەمە بەرباس:

ئەوا سۆڤیەت وەک دوندێکی هاوسەنگی دوندی ئەمەریکا کوژایەوە بەڵام کەس پێی وەها نەبێ ئەمەریکا بەم دیاردەیە ئاسوودە بووە، چونکە ئەمڕۆ لە گەوهەری پێگەی خۆیدا کە بۆتە تاکە دوند، ڕووبەڕووی دوندگەلێکی بێژمار دەبێتەوە، ئەمانە پاش دابەزینی ڕووسیا لەسەر ئێسترەکەی خۆی، هاتنە مەیدانەوە. ئەمەریکا زووتر لە هاوسەنگیی لەگەڵ ڕووسیدا پاڵی دابۆوە بە جەبەخانەیەکی ئەتۆمی و تەکنیکێکی پێشکەوتووی پیشەسازی و جەنگییەوە. ئێستا ئەمەریکا داروەکازەی ئەو جەبەخانەیەی نەماوە، لە ویژەنگیشدا[114] ناتوانی هەڕەشەی ئەتۆمی لە ئەردەن، ڕۆدیسیا، جەزائیر و چەکوسلۆڤاکیا بکات، هیچ چارەی نییە هەر دەبێ تاکتیک و شێوازی مامەڵەی لەگەڵ دونیا بگۆڕێت و ناچارە لە بری هەڕەشە پەنا بۆ باوەڕهێنان بەرێت. کاتی پێویستی دەوێت هەتا خەیاڵە کۆنەکانی زادەی «جەنگی ئەستێران» دەهەڵمێن، بەڵام ئایەندە نێزیکە. کەواتە دەبێ بەرژەوەندناسان ئاوڕ لەم ڕاستییە بدەنەوە، چ لێرە لە عیراق بێ چ لە وەڵاتێکی دیکەی بچووکی وەک خۆمان بێ لە دونیادا، ئەوا دەچینە دونیایەکی نوێوە ئەمیان بە زمانێکی نوێ دەئاخفێ. ژەنیاری کۆنەژێ بێچارە دەمێنێ.

114- ویژەنگ: وهم.

## 7) سەرچاوەکانی هۆشی تۆ؟

دوور نییە ئەم پرسیارە پتر تایبەت بێ بە زانایانی ژین و دەروون وەک لە کەسانی دەرەوەی پیشەوەرانی بابەت. من دەزانم هەموو کەسێکی ئاسایی خاوەن هۆشە، هۆشیش خاوەن یەک یان چەندین سەرچاوەیە، دەبێ چی بن؟ گەر وەک پرسیاری فێرگە سەیری بکەین، بۆ نموونە کامەن پایتەختەکانی ئەفریقای باشوور، دەڵێن «پریێتوریا Pretoria» و «کەپتاون Cape Town» ن، بەڵام پێم وایە مەبەست لە پرسیارەکەت: هۆش چۆن کار دەکات؟ پێگەی «ئەزموون» و «دەرهەستاندن» لە دروست کردنی بیرورِادا چۆنە؟ کامانەن ئەو هۆشانەی بەرهەمیانت خوێندۆتەوە و بەلاتەوە پەسەند بوون؟ ئەدی ناکۆکیی نێوان هۆش و سۆز چی؟ کامیان لای تۆ سەردەستە هزر یان دەروون؟ ئایە ئەم دوانە پێک دێن، تەراز دەبن، یان ناکۆکیان بەردەوام دەبێ؟

من پرسیار لە سەرچاوەکانی هۆش - کە دەکاتەوە مێشک، مێشکۆڵە، درِکەپەتک، کۆئەندامی لیمفاتیک و سیمپاتیک - جێ دەهێڵم و بەرسقی خۆم لەوەدا گرد دەکەمەوە چۆن بیرورِا دەربارەی بابەتەکان دروست دەکەم و برِیاریان لێ دەگرم. بە باوەرِی من زۆر بابەت هەن کاریگەرییان هەیە لەسەر شێوازی بیر کردنەوەی مرۆڤ، هەیە مرۆڤ ئاگایانە هەستیان پێ ناکات بەڵام دەرکیان دەکات لە رِێی ئەزموونی زانایان و لە رِێی سەرنجی پەرتەوە لە بابەتی جۆراوجۆر کە ئاماژەن بۆ بابەتی وەها لێکدانەوەیان دیار نییە. بابەتی دیکە هەن بەرهەستن، وەک توورِەبوون، ناکامی، کەمخەوی و کەمخۆراکیی زیانبەخش، یان وەک مژدەی شادیهێن، کۆسپشکێنی، چاکەکاری، وەدەست هێنانی سەروەری. گشت ئەمانە کاریگەریی ئایەتی و نایەتییان هەیە لەسەر بیر کردنەوە و رِەفتاری مرۆڤ.

لەوانەیە خۆ ڕزگار کردن لە ڕەنگدانەوەی ئەم هۆکارانە بە تەواوی یان تا ڕادەیەک کاریگەرییان خامۆش بکرێتەوە، کارێکی دژوار بێ. بەڵام من دەتوانم جەخت بکەم لەسەر ئەوەی بڕیارەکانی خۆم تاڕادەیەک دەرباز بوون لە خڵتەی وەها چونکە بەهەندیان دەگرم و لێیان نائاگا نیم، چونکە خۆم دەناسم هەم لە بارودۆخی جیاوازدا و هەم بەدەم ڕۆژگاری درێژمەوداوە، لەبەر ئەوە دەبینم بڕیارێکی پێی گەیشتووم لە ئەنجامی ئەزموون و ڕامانەوە، لە گشت بارێکدا جێگیر بووە، بیروڕای وەرزانە لە منەوە دەگمەنە...

من پەی دەبەم بە تێکبەستن و پێکوەربوونی بابەتەکان، فیزیکی بن یا جڤاکی یا کەسەکی. پێگەی «ڕاچەنینی پێشبینی»[115]، هەستی پێش ڕووداو، واتاکێشەکی، دوورەسۆسە، خەون و دیاردەی لەو جۆرە دەرک دەکەم. دەزانم دزاندن، خۆشەویستی و بەرژەوەندیی کەسەکی کاریگەری هەیە، گەر لەسەر دروست کردنی بۆچوون نەیبێ، لەسەر هەڵوێست هەیەتی. ئەم بابەتانە و هی دیکەش دەگەڕێنەوە بۆ بەرایی تەمەن و بۆ میرات، بگرە جیۆگرافیا و مێژووش دوو نییە دەستیان لە پێک هێنانی بیروڕادا هەبێ. ناوهێنانی سوڵتان «عەبدول حەمید»[116] ئەوەم دەهێنێتەوە یاد بەرانبەر پووڵی دونیا فەلەستینی نەفرۆشتە جوو. گەر بە «خدێوی ئیسماعیل»[117] بڵێن دەستبڵاو بووە، بیرم دەڕوات بۆ ئەوەی دەرکی بە بەرژەوەندیی میسر کردووە، دەرفەتی لە جەنگی ئازادیی ئەمەریکا وەرگرت کە تێیدا لۆکەچاندن لەوێ پەکی کەوت،

---

115- ڕاچەنین: رهص، إرهاصات.

116- سوڵتان عەبدول حەمیدی دووەم (1842-1918) سیوچوارەمین سوڵتانی عوسمانی (1876-1909).

117- خدێوی ئیسماعیل (1830-1895) خدێوی میسر و سوودان (1863-1879).

ئەم هات و پەرەی بە لۆکەچاندنی میسر دا تا ئەوەی داهاتی هەناردەی میسر لە دوو ملیۆن جونەیهەوە گەیشتە بیست و دوو ملیۆن. بیر دەکەمەوە لەوەی نە «جەمال عەبدول ناسر»[118] و نە «عەبدول کەریم قاسم»[119] یەک جونیهـ و یەک دیناریان بە دزییەوە ڕەوانەی دەرەوە نەکرد. ئەوەش نیشانە بوو بۆ ئەوەی نیازیان وەها بوو لە وەڵاتی خۆیاندا بمرن.

لە کۆی گشت ئەم سەرنجانە و هی دیکەش کە نە ژماریان هەیە و نە سنوور، بیروڕا هەڵدەچنم. سەرباری ئەوەش هۆشە دەبێتە هۆکاری دابڕ، نەک تەنها لەبەر ئەوەی تاکە دەستاوێژە بۆ هەڵسەنگاندن بەڵکوو لەبەر ئەوەی چەسپیوە بە توانای درێژبوونەوەی خۆکار[120] لە بواری دەرهەستاندن و هەستەوەریدا. ئەمەش خەسڵەتێکی دەرکبەدەرە.

## 8) ئایە نووسەر کاتی نووسین بیر لە نەمری دەکاتەوە؟

نووسەرانیش، وەک جۆرەکانی دیکەی مرۆڤ، ئەمیان جودایە لەویان، هەر وەک چۆن خۆراکفرۆش هەیە لە جۆر، نرخ و کێشدا فریوت دەدا، هەیە لە کەمێکدا فریوت دەدا، هەیە لە گشتدا ڕاستگۆیە. لە نێو نووسەراندا هەیە خامەی خۆی دەخاتە خزمەت ئەوانەی زیاتری دەدەنێ، هەیە گومانوروژێنە، هەیە لە ناوداریی دەگەڕێ و بەم جۆرە هەتا دەگەیتە نووسەری دەستپاک، وەک چۆن دەگەیتە خۆراکفرۆشی

---

118- جمال عبد الناصر (1918-1970) دووەم سەرکۆماری میسر (1956-1970).

119- عبد الكريم قاسم الزبيدي (1914 - 1963) یەکەم سەرووەزیرانی کۆماری عیراق (1958-1963).

120- درێژبوونەوەی خۆکار: التمدد الذاتي.

دەستپاک، ئەویش هەمدیس جیاوازیی هەیە لەمەوە بۆ ئەو لە چەند یان لە گشت خەسڵەتەکانیدا، هەیە، لە ترسان یان لەبەر ئەوەی گومانی هەیە لە سوودی ڕاشکاوی یان لەبەر سەلامەتیی مافێکی ڕەوای خۆی، لە ئاست ناڕەواییدا بێدەنگ دەمێنێ.

گەر بێینە سەر نەمری ئەوا پێم وا نییە کەس هەبێ لێی وەتەنگ بێ، بیدزێنێ و مەیلی لێ نەبێ. لە پێغەمبەر (د) دەگێڕنەوە: مرۆڤ بە مردن لە دونیا دادەبڕێ مەگەر بە دوو شت نەبێ: کارێکی باش لە پاش خۆی بێتە باس کردن، نەوەیەکی باش دەوامە بە ناوهێنانی بێنێ. کەواتە نەمری هیوایەکی ڕەوای ئابڕوومەندی هاندەرە بۆ زیادە بەخشین. بەڵام دووریش نییە کەسێک هەبێ بە مەبەستی ناوداری، پێداگریی لەسەر بەدخوازی بکات.

«بیرنارد شەو» دەربارەی خۆی دەڵێ نووسینەکانی ناگەنە ئاستی نەمری چونکە ئەو باسگەلەی بەسەریان دەکاتەوە لە ژیانی خەڵکدا کاتەکین. «شەکسپیر»[121] لەبەر نەمریی بابەتی نێو شانۆنامەکانی نەمرە. بەو پێوەرەش دەردەکەوێت کە هۆنراوەکەی «ئیمروء ئەلقەیس»[122]: «قفا نبكي من ذكری حبیب ومنزل / بوەستن بگرین بە دیار یار و نشیمەنیەوە» دەمێنێ بەڵام شاکارەکەی «ئیبن ئەلڕوومی»[123] کە تێیدا گەورەکانی زەمانی خۆی سەرزەنشت دەکات، ناچێتە خانەی نەمرییەوە. «ئیبن ئەلڕوومی» دەڵێ:

---

121- شەکسپیر William Shakespeare (1564-1616) شاعیری هەرە ناوداری ئینگلیزی و دونیا.

122- امرؤ القیس (520-565) شاعیرێکی عارەبی سەردەمی پێش ئیسلامە.

123- ابن الرومي - أبوالحسن علي بن العباس بن جریج (836-896) شاعیرێکی ناوداری سەردەمی عەبباسییە.

لهف نفسي على مناكير للنكـ..
ر غضاب مثل السيوف عضاب

ئەوجا ڕێگە خۆش دەکات تا دەگاتە ئەو گەورانەی زەمانی خۆی کە مەبەستی بوون و بەم جۆرە باسیان دەکات:

من كلاب نأى بها كل نأي
عن وفاء الكلاب غدر الذئاب

هونراوە هەڵواسراوەکەی[124] «ئیمروء ئەلقەیس» بە هەوەسبازی و دڵکێشییەوە نەمری بۆ مایەوە، ئاگربارانەکەی «ئیبن ئەلڕوومی» وێڵ کردن، فەرامۆشی و مەرگی بەدەمەوە بوو.

دەگەڕێمەوە و دەڵێم تەمای نەمری ڕێک مەزنییە چونکە کەسی داواکار دەبێ لە ڕادە بەدەر کارامە، زانا، ئازا و خۆنەیست بێ. دەبێ گەر بە نووسەرێکی لاوەکی بەراورد کرا وەک یەکەم گەشتیاری بەستەڵەکی باکوور بێ لەچاو بابای نێو ئوتوبوسی نێوان «باب المعظم» و «بستان الخس»[125].

پاشان نەمری بەرتاوی هۆکاری هەلومەرجی ترسناکە، نووسەرێک لە بریتانیا داوای نەمری بکا دەبێ لە کۆسپی وەها دەرباز بێ سەخت و دژوار، ئاخر ڕکابەری لەسەر نەمری زۆرن، مەرجەکانی نەمری هەم بە جۆر و هەم بە ژمارە توانابەدەرن. مەودای هەوڵ دان بۆ نەمری

---

124- ئەو دەمە هۆنراوەی نایاب بە دیواری کەعبەدا هەڵدەواسران و پێیان دەگوتن «معلقات».

125- دوو گەڕەکی نێزیک یەکدیی نێو شاری بەغدان. ئەو «بستان الخس» ـە ئێستە بووەتە «ساحة النصر».

سەرلەبەری ژیانە، پشتیوانت لە وەدەست هێنانیدا دامەزراندنی دۆستایەتییە لەگەڵ میدیادا. بەڵام هەموو ئەم مەرجانە بۆ وەڵاتێک ژمارەی دانیشتوانی لە گەڕەکێکی بۆ نموونە لەندەن تێپەڕ نەکات، کاڵ دەبنەوە. ڕۆمانی *The Silk Vandetta* «تۆڵەی خوێنینی ئاوریشم» م خوێندەوە - هی نووسەرێکە ناوەکەیم لەیاد نەماوە[126] - دەبینم نووسەر هونەرێکی فرەوان دەنوێنێ لە ناساندنی شوێن و کەسانی بەرباسی داستانەکە، لە ڕوون کردنەوەی جڤاک و گێڕانەوەی مێژوویان و گەیشتۆتە ئاستی داهێنان و توانابەزاندن. گەر چیرۆکنووسێکی عیراقی دەرفەتی هەبا باسێکی وەها دارێژێ دەبا ناوەزد بکرێ بۆ خەڵاتی نۆبڵ و پێشی دەبەخشرا...

### 9) نیشانەکانی شێوازی تۆ و فەلسەفەی ئەو شێوازە...؟

شێواز، هەر وەک چۆن ئاوی چەم ڕێژگەی خۆی دەسەپێنی، خۆی دەسەپێنێ. لە جوانکاریدا من زێدە ئەرکی لێ خەرج ناکەم مەگەر ئەوەندەی نووسین یان هەر هونەرێکی دیکە داوای دەکات. بەشێکی هونەریش سەرلەبەری هەر زێدە ئەرکە، وەک شێوەکاری، پەیکەرسازی و موزیک. لای من شتێک جێگیر دەبێ لە سەرەتاوە هەستێکە و زاوە بەڵام هێندە ڕەسەنایەتیی گرتووە تا بۆتە خۆڕسک. من سەرەتا، لە ئاستی دوکتۆرێکی وردبینەوە چۆن خەریکی پەیدۆزییە لە قووڵی و بەرینیی ئەو دەردەی چارەسەری دەکات، بیر لە بابەتی نووسینەکە دەکەمەوە. لەو دەمەشدا، نموونە دێنە بەر گوێ و چاوم، زۆربەیان لە نووسینەکانی پێشووترمن، دڵکێشم دەکەن بگرە گشت هەستم دەبەن بۆ ئاستی خۆیان. پاشان لە دەمی بەرەژانی هزر و گیانم

126- Victoria Holt - Eleanor Hibbert (1906 -1993) .

بە بیرۆکەوە، هەتا بیرۆکە دەزێ، شێواز بە بەردەوامی خەریکی دروستبوون و ئاوێتەبوونە لەگەڵ بیرۆکەکەدا.

کەواتە ناوەڕۆک و شێواز لای من وێکڕا، هاوکات و هاوئاست دروست دەبن، ئەویش لە تێکەڵەیەکی تەواودا و جودا کردنەوە هەڵناگرن. من نایەم وەک بەرگدروو پەیکەری بیرۆکە هەڵبەستم و پاشان شێوازی بۆ دارِێژم، بەڵکوو ئەو پەیکەرە لە شێوەی خۆیدا پەیدا دەبێ وەک کاری پەیکەرتاش. ئەوجا هاوئاوازیی دەستەواژە، هاوسێیەتیی وشە و ڕستە دەبنە بەشێک لە پێڤاژۆی دروستبوون، بەرەژان و ئەوجا زان، لێرەدا گوتنێک کێش دەکرێ بۆ لای گوتنێکی دیکە هاوزەنگی بێت.

لە دۆخی دوور لە واژەواژ و بچڕانی بیر، دەمێک کات نەرم و ئارام، وەک ڕەوتی گەرمیی خوێن بە دەمارەکاندا، ڕێ دەکات، بەتایبەتی گەر درەنگەشەو بێ، دیاردەیەک پەیدا دەبێ لە جۆری «شیزۆفرینیا» Schizophrenia وەها هەست دەکەم گیانم جودا بۆتەوە لە لەشم. گیانم دەڵێ و دەستم دەنووسێ. زۆر باشیش لەبیرمە یەکەم جار ئەم دیاردەیەم تووش هات، شەوی 20 لەسەر 21 ی مارتی 1949 بوو، کاتێک خەریکی نووسینی گوتارێک بووم بۆ سبەی دەبا بە بۆنەی نەورۆزەوە بیخوێنمەوە، بابەتەکەشی «درووود بۆ شەهیدان» بوو بۆ یادی کوژراوەکانی «وثبة»[127]. دەوری نیوەشەو دەستم دایە نووسین و هەتا پاش بەرەبەیان بەردەوام بووم. کاتێک گەیشتمە باسی «معركة الجسر / شەڕی سەرپردەکە» هەستێک دایگرتم دەتگوت گیانم بە

---

127- «الوثبة»: ڕێپێوانێک بوو لە شاری بەغدای ساڵی 1948 دژ بە حکوومەتی ئەو دەمە. لەسەر «پردی مەئموون» - پاشان ناوی گۆڕا بە «پردی شەهیدان / جسر الشهداء» - دەوڵەت دەستڕێژی لە خەڵک کرد و دەیان کەسی کوشت. ئەو کوشتارە بۆ ئەو زەمانە هەژەندێکی سیاسی بوو، کابینەی حکوومەتی گۆڕی.

گیرسانەوە و باڵابوون جودا دەبێتەوە لە لەشم و هێشتا ئاخاوتنم دەربارەی پەشێویی مێژوو تەواو نەکردبوو کە چی بکات و سەرکەوتن بۆ کێ بنووسێ، گیانم بەم دەستەواژانە سەری کرد:

*«وفي هذة اللحظة الحاسمة الخطيرة إذ إرتبك التأريخ المذعور وضاعت معالم النصر والهزيمة قذف بركان الحق من وقود ثورته جمرة مشتعلة الحشا في صورة فتاة، اي وربي فتاة تصطفق في يديها راية ملطخة بالدم وينعكس من عينيها بريق من عناد الشعب الثائر وفي صدرها تتماوج صرخة الانسانية المندفعة نحو هدفها الأسمى وترسم على ثغرها بسمة الإطمئنان الى النصر الاكيد. تقدمت الصفوف فكانت من الطليعة السامية للحشد الصاخب بمثابة السنان من نصل الرمح، تقدمت وأهابت بالحشود الكثيفة أن تقدمي فتدفقت كسيل العرم لا يردها موت ولا يصدها قضاء واكتسحت ما أمامها من صروح الظلم ومعاقل الطغيان...».*

*«ئەوجا لەو چرکەساتە دابڕ و ترسناکەدا، کە مێژوو لە ترسان پەشۆکا، سیماکانی سەرکەوتن و شکەست بزر بوون، گڕکانی ڕەوایەتی لە سووتماکی شۆڕشەکەیەوە پشکۆیەکی ئاگرینهەناوی لە وێنەی کیژێکدا ڕاماشت، ئەرێ بە خودا سوێند، کیژێک لە دەستیدا ئاڵایەکی خوێنین دەشەکایەوە، لە چاوەکانیدا سەرسەختیی گەلی ڕاپەڕیو بریسکەی دەدایەوە، لە سینەیدا چریکەیەکی مرۆڤانە ڕووەو کەشکەڵانی ئامانج شەپۆلی دەدا، لەسەر زاری خەندەی دڵنیایی لە سەرکەوتن هاتە نەخشاندن. هاتە پێشاری پۆلەکان، بووە پێشەنگی باڵای ئاپۆرەیەکی پڕدەنگ، دەتگوت نووکە لە باڵای ڕمدا. پێشکەوت و بانگی لە ئاپۆری پڕژمار ڕاداشت: پێشکەون! وەک چەمی زۆر خۆڕ شاڵاویان هێنا، نە مەرگ دەیگەڕاننەوە نە قەزا بەرگەی*

*دەگرتن، چی کۆشکی ستەم و قەڵای زۆرداری هەیە، گشتی ڕاماڵی».*

لە کۆتادا گوتم:

*«عندئذ خفض التأريخ قامته إجلالا وسجل النصر العظيم للشعب العظيم. وما كان للتأريخ أن يفعل غير ذلک».*

*«ئەوجا مێژوو بۆ سەلماندنی شکۆ باڵای چەماندەوە و سەرکەوتنی مەزنی بۆ گەلی مەزن تۆمار کرد. مێژوو چ چارەی نەبوو، هەر دەبا وەها بکات».*

ئەمەش دەستەواژەیەکی دیکەیە لە لاپەڕەی 126 ی کتێبەکەی خۆم «من هموم الحیاة» دەربارەی پێویستیی پووچاندنەوەی بەڵگەکانی «ناڕەوایەتی»[128]، نەک هەر ڕەپێشخستنی بەڵگەکانی «ڕەوایەتی»:

*«ذلک ان خلو التأريخ من قولة «لا» تلقاء الباطل المستفحل هو تعطيل لنصف قوة الحق في طلب الكمال لأن دحض الباطل نصف المسافة الى تمام البرهان»[129].*

---

128- ناڕەوایەتی: باطل.

129- مامۆستا مەسعوود محەمەد خۆی ئەو کتێبەی «من هموم الحیاة»ـەی تەرجەمەی کوردی کردووە و ناوی ناوە: «لە پەرۆشەکانی ژیان». لەوێدا بۆ ڕوون کردنەوەی ئەو ڕاگواستەیەی سەرەوە، لە پەراوێزی ژمارە 33 دەنووسێ:

*«ئەم عیبارەتە چڕوپڕە دەبێ مامەڵەتی تابلۆیەکی هونەری لەگەڵدا بکرێت چونکە تەرجەمەی دەقاودەق هەڵناگرێت. مەبەس لێی ئەمەیە:*

پێم وانییە ڕێگە هەبێ بۆ بژارەیەکی دیکەی وەک هەڵبژاردنی شێواز پاش پێگەیشتنی بیرۆکەکە چونکە گەر وێکرا دروست نەبن و لە دەرفەتێکی هەڵقوولێنی گیاندا وێکرا نەزێن، دەستەواژەکە دەبێتە جەستەی مۆمپۆش[130].

لەم نووسینەمەوە دەکرێ لە ڕێچکەی تایبەتمەندیی شێوازی من و لە فەلسەفەی ئەو شێوازە ڕامێنیت.

## 10) ئێمە و جیهان؟

ئێمە لە بارێکدا دەژین لە گشت ڕوویەکەوە دەگمەنە، هیچ گەلێکی دونیا تووشی نەبووە، من وەک نووسەرێکی دوورەپەرێزی نێو ماڵی خۆم، ناتوانم وەڵامی ئەم پرسیارەی تۆ بدەمەوە مەگەر لە نێوان ئێمە و جیهاندا سنوورێکی هاوبەش پەیدا بێ بایی هاتوچۆ بەرین بێت، لایەنی جیاواز لێ کۆببنەوە بۆ گفتوگۆ. من سیاسەتمەدار نیم کاروبار هەڵسووڕێنم پێویستیی ناچارم بکات بە کار و گوتار پەنا بۆ هەڵمەت و هەڵاتن بەرم.

---

*پێویستە «باطل» و بەڵگەکانی بپووچێنەوە نەک هەر بەڵگەی چەسپاندنی «حق» ڕەپێش بخرێت چونکە «باطل» یش بارتەقای «حق» بەڵگەی خۆی سازداوە بۆیەیە پووچاندنەوەی «باطل» بڕینی نیوەی ڕێگەیە بەرەو بەڵگەی بێ کەلەبەر دەنا «حق» نیوەی هێزەکەی پێوە نامێنێ لە هەوڵی خۆ تەسەل کردن».*

بڕوانە مەسعوود محەمەد، *«لە پەرۆشەکانی ژیان»*، لاپەڕە 201، چاپی یەکەم 1997 ستۆکهۆلم، وەشانی «کتێبی ئەرزان». سایتی مامۆستا: www.mamosta.net

130- مۆمپۆش: مۆمیاکراو - محنط.

### 11) ئێمە و ژیار؟

ئێمە لێمان خۆش هاتووە باسی ژیار لە گۆشەنیگایەکی مێدیاکارەوە بکەین کە جەخت دەکات لەسەر خۆپیرۆزاندن[131] و نازین بە کۆنەمەزنایەتی، لەوانەشە کوتانەوەی ئەو باسانە لە ماوەیەکی درێژخایەندا بووبێتە هۆی باوەڕهێنانی تەنانەت ئەو کەسانەش کە هەڵیان بەستووە نەک تەنها بیسەرانی. ئەم خۆپیرۆزاندنە خەسڵەتێکی جیهانی سێیەمە بەگشتی.

هەرچی دونیای پێشکەوتووە دێن تۆژینەوەی کێشە، کەماسی، لایەنی پەککەوتە و لەنگیی بەرژەوەند دەخەنە بەرباس. گەر سیاسەتمەدارێکی لێزانیش کەوتە خۆبادان بە کۆنەمەزنایەتییەوە خەڵک لێی دەڕاسێن و کێشەی ڕۆژگار دەدەنەوە بە ڕوویدا کە پێویستی بە چارەسەرە. گەر تەماشای ڕۆژنامەکانیان بکەیت دەبینی هێندە پڕن لە ڕەخنە گرتن لە ناپەسەندی تا ئەوەی پێت وایە ئەم میللەتەی وەها باری بەم هەموو بەڵایە گرانە هێندە نابا دەڕمێ. مەزنایەتی، تێری، ئاسوودەیی، سازمان و پشوو بابەتێکن دابینکراو، پێویستیان بە دەهۆڵ و زوڕنای کەس نییە، خاوەنەکەشی باسی ناکا مەگەر نەخۆشیی دەروونی هەبێ.

جا گەر ئێمە لە بەستێنی مێدیاکاری دەربچین و بابەتەکە لە ڕاستینەی خۆیەوە باس بکەین، ئەوا ژیاری عیراقی دێرین لەگوێرەی ئەو سەردەمەی خۆی دیاردەیەکی وزەبەخش بووە. لەم گوتەیەشدا ئێمە دڵکێشی خاڵە گەشەکانی ئەو ژیارەین باسی وەک ستەم، گەندەڵی، هەژاری، کۆیلایەتی و هاوجۆرەکانی وەلا دەنێین. پاشان ئەو ژیارە دێرینە خاپوور دەبێ و لاپەڕەکانی دەپێچرێنەوە هەتا شوێنەوارناسانی ناعارەب و ناموسڵمان دێن و ئاشکرایان دەکەن، ئەوان نەبان کەس نەیدەزانی سۆمەر و ئەکەد و پاشای ئاشووریان کێن،

---

131- خۆپیرۆزاندن: تقديس الذات.

چونکە عیراقی ئێستا و عیراقی سەردەمی سەرهەڵدانی ئیسلام تەواو دابڕاوە لە عیراقی بابیلی و ئاشووری و ئەوانەی پێش ئەوانیش بوون بە نێزیکەی هەزار ساڵ کاتێک کورشی فارس هات و بابیلی داگیر کرد و ئەم وەڵاتەی خستە سەر ئیمپەراتۆریی خۆی. ئەم فەرمانڕەوایی فارسی ئەخمینی (هەخامەنشی) یە و بەدوا خۆشیدا، فەرمانڕەوایی سلوکی، ئەشکانی و ئەوجا ساسانی لە ناوەڕاستەکانی سەدەی شەشەمی بەر لە زایینەوە دەوامی بوو هەتا هاتنی ئیسلام.

موسڵمان بە دینێکەوە هاتن «چی پێش خۆی هەیە ڕیشەکێشی بکات»، گەر «لاماسوو»[132] یان دیتبا هەلاهەلایان دەکرد، مەگەر ئەوان بتەکانی حیجازیان نەڕماند، ئێستا چۆن پیرۆزیی دەبەخشن بە بتێک لە چەسپاندنی بتپەرستیدا لەوەی خۆیان کاریگەرتر بێت. گوتەی «ئیسلام درێژەدانە بە پەیامی ئەکەد و بابل» گوتەیەکی سەیروسەمەرەیە هۆش لێی گێژ دەمێنێ. سەرباری ئەوەش، مێژووی کۆن نابێتە پاساوی دیاردەی ناژیرانە، دادپەروەرانە یان ژیرانەی پاشکات ڕوو دەدەن. تۆ سەیری یۆنان بکە، یەکەم ژیارە لەسەر بنەمای هۆش و لۆژیک بنیات نرابێت بەڵام وەها لە خەڵکی دیکە دابڕاون، لە هیچ بوارێکدا کە پەیوەندی بە ژیانی مرۆڤی سەردەمەوە هەبێ، سەنگیان نەماوە.

جا بۆ ئەوەی ناسنامەیەک بدەیتە ژیاری ئێستەمان بڕوانە بازاڕمان، جادەمان، دادگەمان، پۆلیسمان، ئوستانمان، دەزگەی ئاسایشمان، کشتوکاڵمان، پیشەسازیمان، خوێندنی زانکۆکانمان، مەودای برەوی داد و سیستەم لە توێژاڵەکانماندا، هەناردەمان لە برنج، گەنم، جۆ چەندە،

132– «لاماسوو» Lamassu پەیکەری گیانەوەرێکی خەیاڵکردە، سەری مرۆڤە، لەشی شێر یان گایە و باڵی هەڵۆیە، سەردەمی ئاشووریان، بۆ پاراستنی شار، دەروازەیان پێ دەڕازاندەوە.

له گۆشت و جوجەسازی چەندە، تا چ ڕادەیەک پۆلیس، کەسی حیزبی و بابای خاوەن دەسەڵات ڕێز لە هەژاری بێنەوا دەگرێت، چوستیی دەزگەی فەرمی و نیمچەفەرمیمان، سازمانی خانمان، فێرخوازان، کرێکاران و جووتیارانمان، دەمڕاستانمان تا چ ڕادەیەک خۆ بەرز ڕادەگرن لە ئاست چاوچنۆکی، تەمبەلی، گەڕۆک[133] و ئێرکۆندیشین، ئازادیی دەربڕین و ڕەفتار بۆ نووسەر، بیرمەند و وەستایان چەندە... هەتا کۆتایی لیستێکی درێژ لەم جۆرە پرسیارانە. کۆی وەڵامەکان دەکاتەوە ژیاری ئێمە.

## 12) نووسەر و ئایەندە؟

ئەم پرسیارە نووسەری وەڵاتانی دیکە دەگرێتەوە پتر لە نووسەری عیراقی کە ڕۆژگاری ئێستەی، ئایەندەی لێی پەشۆکاندووە.

وەرە پرسیارەکە لە شێوە «دەرهەست» ـەکەیدا وەرگرین کە دەڵێ «نووسەر» بە هونەرەکەی پەیوەندیی هەیە بە ئایەندەی مرۆڤایەتییەوە. لەم ڕوانگەیەوە نووسەر، لە کۆچەرخی بزوێنەری کۆمەڵگەکاندا بەگشتی، دەبێتە ئەندامێکی زیندەی چالاک. دڵنیاش بە لەوەی هەتا ئاستی ژیار هەڵکشێ گرینگیی نووسەر زیاد دەکات، هەر وەک هونەرمەند و زانستکار، وەستا و داهێنەر، چونکە گشت باس و بابەت و کەسێک پەیوەندیی هەبێت بە لایەنی هۆشیاریی جڤاکی ژیارمەندەوە، بە ئەندازەی فرەوانبوون و قووڵبوونەوەی ژیار، پێگەی هەڵدەکشێ.

ئەوجا بێ ئەوەی لایەنگیر بم دەڵێم نووسەر بەهۆی فرەجۆریی بواری کاری خۆی، لە نووسەری ئەدەبەوە بۆ نووسەری چیرۆک، نووسەری

---

133- گەڕۆک: سەیارە.

گوتار، نووسەری مێژوو، نووسەری هزر... لە ڕێڕەوی مێژوودا پێگەیەکی گرینگی پێ دەبخشرێ چونکە کاری ڕۆژانەی ئەو پەیوەندیی بە گوزەرانی ڕۆژانەی خەڵکەوە هەیە کە دەکاتەوە مێژوو چونکە هەر خۆیەتی بنگەی ڕووداوی مێژووکرد، دوور نییە گوتارێکی ورووژێنەر ببێتە بزوێنەری هەستی فێرخوازان، کرێکاران یان تۆژەکانی دیکەی کاریگەر لە کۆمەڵگەدا و نەخشی دیار بێ.

پاشان هونەری هەفتەم - یان هەر پێگەیەکی دیکەی هەیەتی - هاتە پێش: سینەما و تەلەڤیزیۆن و شانۆشیان لە تەک بێ، بەم هاتنەش گرینگیی نووسین زیادتر بوو چونکە ئەمجا نووسین بووە بابەتێکی بەرخوێندن و بەردیتن و لە ڕێی فیلم و سیریاڵەوە چووە گشت ماڵانەوە. بەڵام هەموو ئەمانە بوون و دەبن بێ پلانڕێژیی پێشکات و بێ ئەوەی نووسەران ویستی هاوکۆیان تێدا هەبێ، ئەمیان ملکەچی ڕێسای ئابووری و سیاسی و هەروەها ئارەزووی ئاپۆرەیە.

بیروڕا دەربارەی ئەم دۆخەش هەمەجۆرە، هەیە دەڵێ، هەم بۆ پاراستنی مافی خۆیان، هەم بۆ ڕێبەستن لە ڕیزپەڕی و شێواندن، هەم لە پەرۆشی بۆ بەرژەوەندیی گشتی وەها پێویست و باشە نووسەران خۆیان و کاروباری خۆیان شەتەک بدەن بۆ ئەوەی بۆچوونیان هەبێ دەربارەی ئەوەی دەخرێتە بەر خوێندنەوە و شێوازی ڕاگەیاندنی. هەیشە دەڵێ سەپاندنی دەسەڵات بەسەر نووسیندا، تەنانەت گەر لە نووسەران خۆشیانەوە بێت، دەرئەنجامی بەرگومانە لەبەر ئەوە بۆ وەرگر، کڕیار و بازرگان، کە دەکاتەوە زۆرینەی خەڵک، وەها باشترە نووسەر (ی خاوەن خوێنەری گشتی) ڕەها بێ لە کۆتوبەند بەتایبەتی لەبەر ئەوەی کەمێک لەو کۆتوبەندە دەرهاویشتەی زۆریان دەبێ، دەبینی چەندین جۆرە نووسین خامۆش دەبنەوە لەبەر ئەوەی دەسەڵات پێی وایە ناجۆرن و بابەتی وەها پەیدا دەکەن لای خۆیان

پەسەندن کەچی هەم خەڵک و هەم داکەوت[134] دیدی جیاوازە. ئەمەش باسێکە دەربارەی ئایەندەی نووسەران، بەڵام باس لە ئایەندە بەدەست نووسەرانەوە هاسان نییە، ئەویش دەکرێ لە سێ تەوەردا پوختی بکەینەوە:

یەکەم تەوەری ئەو نووسەرانەی نووسینیان کردۆتە پیشە بۆ دابین کردنی بژێو، ئەمانەش چ کاریگەرییەکیان نییە لە ویستی خۆیانەوە، لە بەرنامەیەکی هەڵبژاردە و یا ئامانجێکی دیاریکراوەوە سەرچاوە بگرێ. ئەمانە چ کاریگەرییان نییە پێشبینی بکرێ بەڵام زۆریی ژمارەیان تاوێکی شەپرێوانەی هەیە لە پەسەند کردنی لایەنێک بەسەر لایەنێکی دیکەدا.

دووەم: تەوەری نووسەرانی نایابی خاوەن پەیامن، ئەمانە بە هۆی جیاوازیی بیروڕایانەوە بەگشتی دەبنە مایەی مشتومڕ و دڵەڕاوکێ. هەر ئەمەشە دەبێتە بەربەست لە یەکبوونیان. گەر یەک بگرن تاویان مەزن دەبێ.

تەوەری سێیەم نووسەری پەرجووە[135] و لە ڕووی کاریگەرییەوە دەکەوێتە نێوان شەکسپیر و مارکسەوە، خوێنەریش دەبێ بیر لە پێگەی ئەم و ئەویان بکاتەوە و بە دیدی خۆی کاریگەرییان دیاری بکات.

گشت ئەمانەش لە بڕیاری داکەوتێکدان فرەوانتر لە داکەوتی نووسەران و جەنجاڵ بە پەستان و بەربەست و بەرتەکی هەموو شتێکی نێو جڤاک، هەر لە شەپرێوەوە هەتا پەسەند و سازدراو.

### 13) نووسەر و ڕابردوو؟

134- داکەوت: واقع.

135- پەرجوو: معجزة.

پرسیارەکە داوای ڕوون کردنەوە دەکات بەڵام ڕوون ناکرێتەوە چونکە خاوەن پرسیار بزرە لەبەر ئەوە وەڵامێک دەدەمەوە زادەی لێکدانەوەی خۆمە: نووسەر هەیە ڕابردوو پشتگوێ دەخات گۆیا لەچاو ئێستەدا سەردەمێکی دواکەوتووە. هەیشە ڕابردووی بێ گۆڕانکاریی لە لا پەسەندە و بە هۆش تێیدا دەژی. هەیشە ورد دەبێتەوە لە ڕابردوو بە مەبەستی تەیار کردنی دەستاوێژەکانی خۆی بۆ هەڵسوکەوت لەتەک کێشەکانی ئێستا و ئایەندەدا، ئەم دەستەیەش بەگوێرەی ڕێچکەی هزری و ئایدیۆلۆژییان - کە گشتیان هەڵگەڕاونەتەوە و بوونەتە فێرگەی سیاسی- ڕێبازیان لەیەک جودا دەبنەوە.

نووسەری جیددی سەربە هەر فێرگەیەکی ئایدیۆلۆژی و هزری بێت ناتوانێ خۆی لە ڕابردوو داماڵێ دەنا ڕەگوڕیشەی خۆی دەبڕێت و دەکەوێتە سەر ئاو، وەک ئەوەی پەیوەندیی خۆی بە دایکوباوکەوە، بە نشیمەنی میللیی خۆیەوە ببڕێ. ئەمەیان لە لایەن دامەزرانی هەستی بە داکەوت، بە پتەویی ئەو زەوییەی لەسەری وەستاوە، بە گەنجینەیەک باشترین خۆراک دەداتە توانای داهێنانی. گەر بێینە سەر ڕسکانی ئەدەبی و هەڵکشانی باڵای خۆی لە نێو دارستانی بەرینی شادرەختاندا، گەر ڕابردوو بەسەر خۆیدا واڵا بکات، بۆی دەبێتە چەترێک مەودای ئەو ناودارییەی بۆ فرەوانتر دەکات کە دەیخاتە بەرچاوی خەڵک یان بۆی دەبێتە ئەسپ و ئەمیش بەسواریی ئەسپ هەم باڵای هەڵدەکشێ و هەم سەری باڵا دەچێت.

بە بۆچوونی من، نووسەر گەر بۆی نەلوا تەمەن لە ئایەندە بخوازێت و بیخاتە سەر تەمەنی خۆی چونکە ناکرێ دەست بەرین بۆ زەمانێکی جارێ نەزاو، خۆ دەتوانێت بە لەئامێز گرتنی ڕابردوو تەمەنی خۆی فرەپات بکاتەوە، ئەمیش کارێکە هەرگیز سەخت نەبوە بۆ کەسی ئارام و خۆڕاگر. هەر لێرەدا بۆچوونێکی دیکەش دەخەمە بەر ڕوانگەی بینەر و دەڵێم ئەو ئەدیبەی دەرکی بۆ ڕابردوو بگاتە ڕادەیەک ئێستای بکاتە

درێژەپێدانێکی دانەبڕاو لێی، دەشتوانێت بگاتە باشترین شیمانەگەلی ئایەندە. ناشبێ کەسمان بێئاگا بێت لەو ڕاستییە مەزنەی دەڵێ خودی هەبوون[136] پرتەیەکی مەزنی ڕەهای ماکە[137] تێیدا زەمان و زەمین و ڕەهەندەکانی دیکەی هەستبەدەر یەکانگیر دەبن، جا ئەو کەسەی بتوانێ بەربەستی نێوان خۆی و ڕەها ببڕێ - بە هەر دەستاوێژێکی ڕۆچوون بێت لە ڕاستینەی ڕەهادا - پێواری[138] لێ ئاشکرا دەبێ و شاراوەکانی گەردیلە، فۆتۆن، ئەلیکترۆن و لەوانیش وردتر تێدەگات، بگرە دەرکی سۆبژەی خۆیشی دەکات، لە نێو نهێنیی هەبووندا سەردەری لەو نهێنییەش دەکات.

ڕاستە بڕینی بەربەستی ڕاستینەی ڕەها تونابەدەرە بەڵام هەوڵی بەردەوام بۆ بڕینی و هەروەها سەرخستنی توانای بڕین - هەم بە پەیدۆزیی خۆکرد و هەم بە پەیدۆزیی زانست و دەرئەنجامی کاری پاش هەوڵ و خۆڕاگری و پێگیریی بلیمەتان و دزە کردن بۆ هەستی تەنکاڵەی دونیای شاراوە - شایانی ئەوەیە ڕێبەری بکات ڕووە زایەڵە و تیشکاڵەی لەو بابەتەی فریشتە چاوەڕێی دەکرد و گوتی: «*وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَاعِدَ لِلسَّمْعِ – سەکۆمان لە ئاسمان دەگرت بۆ گوێڕادێرین*»[139]. ئەمەش بانگهێشتن نییە بۆ سۆفیگەری بەڵکوو پەرۆشییە بۆ فیزیک.

فرەوانیی مەیدانی نووسەر ڕەهایە، گشت گەردوون دەگرێتەوە، ناکرێ لە گۆڕەپانێکدا سنووردار بکرێت پسپۆریی لێ کرابێتە پەرژین.

---

136- هەبوون: وجود.

137- ماک: ماهیة.

138- پێوار: «غیب» - هەژار، «هەنبانەبۆرینە»، وەشانی «سروش»، تاران 1368.

139- ئایەتی 9 لە سوورەتی «جن».

### 14) [بزره...]

### 15) ئایه تۆ فێرگەیت، یان تەوژمیت یان...؟

پێم وایه من «یان...» ـم. «فێرگه» فرەوانه پێشم وەها نییه زیانی هەبێ گەر به «فێرگه» دانرێم چونکه له سنووری چارەنووسی ڕاستیبیندا پاکم، ڕاستگۆم، بێمێشکیش نیم، له چەندین بواردا، له دالآن و پله و پایەی جڤاکدا ئازموودەم، شێوازی دارِشتنم نەوی نییه، له ماڵێکدا چاوم به دونیا ڕۆشنا بووه بۆ خۆی شافێرگه بووه، ئەویش له سایەی باوکێکی فرەمەزنی وەها له سازگاریی ویژدان و ڕاستگۆیی زماندا، له ئارامیی ماک و گەوهەرناسیی ڕەوایەتی بێ ترس و بێ دەستدرێژیدا، کەس نەی دەگەیشتێ.

من تەوژم نیم و ناشبێ ببمه تەوژم چونکه من له بیروباوەڕدا وەرزانه نیم، زۆر و درێژیش ماندوو بووم به دارِشتنی نەخشەیەکی هزریی هەبوون، پارچەکانی یەکانگیر بن، ئاوازەکانی هاوئاهەنگ بن، بزاوتنی هاونەواز بێ. بڕوام به مێروو پەیوەنده لەتەک باوەڕم به کاکێشان (گالاکسی)، یان هاوکێشەکانی فیزیا و پێکهاتنی وەڵاتان، گەمەی شەترەنج و مەقامی نەهاوەند...

کاتێک دەڵێن ئەسکەندەری مەکەدۆنی پەلاماری ئاسیای دا بیرم بۆ گورگ دەچێ کاوڕ دەخوات، بەرخ به گیا دەژی، ڕوەک هەیه مێشومەگەز دەخوات. کوشتن ڕووداوێکه، هەر له سەرەتای زان و بڵاوبوونەوەی ژیان له خانەدا، بەشێوەی بوونی هێزەکی Potential پەیدا دەبێ - *«إن النفس لأمارة بالسوء – دەروون فەرماندەری*

*بەدکاریە»*[140] - ئاژەڵداری و بازرگانیی گۆشت و لەبرسا مردن.
«باران» هەم تێراویم بەبیر دێنێ هەم وشکەساڵی. هۆشم جەنجاڵە بە ململانێی دەوڵەتان لەسەر سەرچاوەی ئاو، سوورِی ئاشی ئاو، کەناری ئاو کە بۆتە جێی نمایشی شاجوانان. ئاو بە لێککاریی ئۆکسیژین و هایدرۆژین پێ دێ، بۆمبی ئەتۆمیش لە پەرت کردنی پێکهاتەکانی ئەتۆم و هەڵوەشاندنەوەی تێکبەستنیان دێتە بەرهەم. بەم جۆرە واتاکێشەکێ و شێوەکێشەکی لە خەیاڵمدا دێنە کایەوە، گەر بە ویستی ئاگایانەی خۆم ڕێبەستیان نەکەم دەروون مەودایەکی وەها دوور دەبڕێ کەس بیری لێ ناکاتەوە.

ئەم خەسڵەتەم لای خەڵک نابێتە مایەی گەورەبوونی من چونکە لە بێدەنگی و نهێنیدا کارایە بەڵام تاوی لەسەر ڕەفتار و نووسینم هەیە و ڕەهەندێکی فەلسەفییانەی وەهایان پێ دەبەخشێت لە وانەی فەلسەفەدا پەیدا نابن. بیر بکەوە لەوەی من کاتێک بڕیار دەدەم ڕەخنە لە شتێک یان کەسێک بگرم، لە خەیاڵی خۆمدا گشت دەرفەتێکی خۆداکۆکی[141] بۆ دەڕەخسێنم، گشت پێویستی و بیانوویەک دەخوێنمەوە کە بوونەتە هۆکاری ئەوەی جێی ڕەخنەیە، بارودۆخی هاوجۆر دەهێنمەوە بەرچاوی خەیاڵم کە هەڵوێستی ڕەخنەکارانەیان هەڵگرتووە، دەکەومە پەیجۆری لە هەبوون و نەبوونی بژارەی دیکەی جودا لەوەی ڕووی دا و ڕادەی هاسانی و دژواریی بژارەی وەها. خۆم دەخەمە هەڵسەنگاندنێکی سەختی دەروون بۆ داکۆکیی سەختگیرانە لەوەی ڕەخنەی لێ دەگرم.

کاتێکیش کەسێک پەلامارم دەدا و سنووری دادپەروەریش دەبەزێنێت شیمانەیەکی گەورەی بۆ تەرخان دەکەم بەوەی بڕوای هەیە بە

---

140- ئایەتی 53 سوورەتی «یووسف».

141- خۆداکۆکی: داکۆکی لە خۆ کردن.

دروستیی کرداری خۆی لە بەشێکی گرینگی هەڵوێستی خۆیدا. بە خواستی خۆم ئاسانکاریی بۆ دەکەم و دەڵێم گەر کەماسییە شاراوەکانی منی دیتبا مافی دەبوو ڕەخنەم لێ بگرێ. بەو جۆرە خۆم دەخەمە «خانەی بەرتاوان» و ئەویش دەکەمە دادوەرێک لێم بکەوێتە پرسینەوە، لێرەشدا - بە بەراورد لەگەڵ ئەو بارەی خۆم تێیدا ڕەخنەگرم - نە دەرفەتی وەها گەش بە خۆم دەدەم و نە ئەرکی وەها سەختیش دەخەمە ئەستۆی بەرانبەر.

ئەمە منم و ئەوەندەی گوتم نابێتە مایەی پووچاندنەوەی ئەوەی نەمگوتبێ دەربارەی خۆم. جا بۆ خۆت جێگەیەکم لە نێوان «فێرگە»، «تەوژم» و «یان...» دا بۆ هەڵبژێرە.

## 16) چۆن بیر دەکەیتەوە؟

گەر مەبەستی پرسیارەکەم لێ ڕوون با وەڵامدانەوەی هاسان دەبوو. چۆن بیر دەکەمەوە؟ وەک خەڵک بیر دەکەمەوە. بیر لە دیاردەی بینراو، بیستراو، خەیاڵکرد و هەستپێکراو گیردەکەم، لە دەنکە تووەوە هەتا ئەستێرەی گەلاوێژ[142]، لە فەندی دامەوە، هەتا گومڕایی و جادوو هەتا دەگاتە کەنارەکانی [...] ئەتلانتیک! گەر خافڵێنەرێک نەیەتە ڕێ، من دانابڕێم لە بیر کردنەوە، بیر کردنەوەم قووڵ و پێداگرانەیە و دۆزێکیش بێتە ڕێ داوای وەڵامی بۆ دەکەم جا هەر دۆزێک بێت، وەڵامێکیش ناسەلمێنم گەر شیمانەی نایەتی[143] لێی ڕاست بێتەوە، وەڵامێکم دەوێت لە ئاست هەموو ئاڵۆزییەکدا خۆڕاگر بێت. من

---

142- گەلاوێژ: نجم الشعری Sirius.

143- نایەتی بۆ نێگەتیف - و ئایەتی بۆ پۆزەتیف.

لایەنگری پێکەوە ژیانم گەرچی باجیشی هەبێ، چونکە مەترسیی کێشمەکێشی چاوچنۆکی سنووربەدەرە.

وردەکاریی لە واتای دیاردەکان دەمگەیەنێتە ئەوەی مردن بە هۆی پیربوونەوە دەکاتەوە کۆتابوونی ژیان نەک دژوەستاوی ژیان، بەڵام کوشتن، خنکان، سووتان و بابەتی دیکەی هاوجۆریان، کە دەبنە مایەی بڕانەوەی ژیانێک وەها نەبا بەردەوام دەبوو، دژوەستاوی ژیانن. کوژانەوەی چرا بەهۆی نەمانی زەیتەکەی نابێتە دژوەستاوی ڕۆشناییەکەی بەڵام فوو لێ کردنی بەهێز، ئاو پێدا کردن و داپۆشینی پڵیتەکەی دەبێتە دژوەستان. شەو کۆتابوونی ڕۆژە نەک دژوەستاوی ڕۆژ، ئەوەتا ڕۆژ لەو ڕووبەرانەی زەوی کە ڕووەو خۆرن هەر بەردەوامە.

درۆ لە یەک ڕاستینەدا دژوەستاوی ڕاستگۆییە، بەڵام درۆ لە نرخی ڕۆندا نابێتە دژوەستاوی ڕاستینەی شیرینیی هەنگوین. بەهێزترین بەڵگە بۆ هەبوونی ڕێکخستن لە گەردووندا بریتییە لەوەی ڕەت کردنەوەی دژوارترە. هەژاری نابێتە دژوەستاوی زەنگینی بەڵام نابووتبوون دژوەستانە. جیاوازیی بەرژەوەند لە کەسێکەوە بۆ کەسێک نابێتە دژوەستان چونکە سڕینەوەی یەک لەو دژوەستاوە دەکاتەوە سوودمەندبوونی ئەوەی دیکە، وەک سڕینەوەی دز بەرانبەر خاوەن ماڵ، کەچی سڕینەوەی فرۆشیار سوود بە کڕیار ناگەیەنێت، گەرچی بەرژەوەندیان لە نرخی کاڵادا جودایە.

بابەتی لەم جۆرە بێژمارن کە هۆشی پەلەکار لێیان بەهەڵە دەچێ و گەر لە دۆزی گرینگدا بەهەڵەدا چوو دوور نییە مەرگی بەدەمەوە بێ، گوتەی «ما فاز باللذات إلا الجسور - تەنها کەسی سەرچڵ خۆشینۆشە» هێندەی سەرکێشی و سنووربەزێنی تێدایە زۆر جار دەروازە بۆ مەرگەسات دەکاتەوە.

زیاتر بەوە هەراسان دەبم گەر پرسیارم لێ بکرێت دەربارەی دەرئەنجامی فڵانە بابەت، ئاخر هۆکار زۆرن و لایەنی بەرگۆڕین لە شیمانەیەک زیاتریان هەیە، وەڵامی پرسیاری وەها نە دەبێتە بڕیاردەری چارەنووسی بابەت و نە دەستکاری ڕەوتەکەی دەکات. مرۆڤ تەنها ئەوەی بۆ دەمێنێتەوە بەپێی توانا، خۆی بۆ پێشهات ئامادە بکات و خۆی ڕاهێزێت بۆ بەرەنگاربوونەوەی شیمانەکان. ئەمما پرسیاری ئایە فڵانەکەس پووڵەکەی لە بانک دەکێشێتەوە یان لە بەرتیلدان بە کارمەندان دەستبڵاوتر دەبێت باسگەلێکن وەڵامیان لە خانەی بەختگرتنەوەدا جێ دەگرن.

خۆم خەریک ناکەم بە «شیمانەی لە هەموان شیاوتر» مەگەر ڕەفتار و هەڵوێستم بەند بێ بە شیمانەی ڕووداوەوە. گەر نیازی سەفەر یان ئاودانی باخەکەم هەبێ بیر لە شیمانەی بارانبارین دەکەمەوە. گەردوون بە سنووربەدەر دەزانم چونکە سنووردارێی گەردوون - مەگەر بە هەبوونی دەسەڵاتێک سنوور بۆ فرەوانبوونی دابنێ - دەنا ڕێگەی نییە. ئەوجا لەبەر ئەوەی لە وردبوونەوەشدا دەردەکەوێت کە سنووردارێی گەردوون نەگونجاوە هەوڵم داوە فۆرمێکی فیزیکی بدۆزمەوە سنوورداری و سنووربەدەرێی هاوکاتی گەردوون بسلەمێنێت، وەک ئەو بارودۆخانەی لە «تیۆریی ڕێژەیی»ی ئاینیشتایندا[144] جووتسروشتن، بەڵام هەتا ئێستا ناکام.

### 17) کەسانی پێشەنگ لە بواری هزر و ڕۆشنبیریی عیراقیدا کێن؟

144- ئەلبێرت ئاینیشتاین Albert Einstein (1879-1955) زانای هەرە گەورەی فیزیکە، ساڵی 1921 خەڵاتی نۆبڵی وەرگرت.

من به هۆی بارودۆخی سەختی خۆمەوە تەنها بە بەشێکی کەمی پەخشکراوەکاندا ڕادەگەم و خۆیشم ئامادە نەکردووە بۆ یاد کردنەوەی کەسانی پێشەنگ لە بواری زانیاردا. پێشەنگیش بە داهێنانێکی نوێی دابڕاو لە تەوژمی گشتیی فەرهەنگ چێ نابێت، دەبێت ڕێچکەیەک بدۆزیتەوە بیرۆکەکان یەک بەدوا یەکدا بیگرنە بەر و بزاڤی هزری تێیدا بەردەوام بێت. هەر بۆ نموونە، ڕاست کردنەوەی شێوازێکی باوی دێرە هۆنراوەیەک یان چاک کردنی ڕۆژی ڕووداوێکی مێژووکرد یان هەر بابەتێکی وەها سنووردار نابێتە پێشەنگی. یەک لە مەرجەکانی پێشەنگی ئەوەیە بیروڕای نوێ لە بابەتەکەی خۆیدا جێی باوەڕ بێ یان بایی نێزیک بوونەوە لە باوەڕهێنان بەرداکۆکی[145] بێت.

لەبەر ئەم هۆکارانە دەترسم گەر چەند ناوێک بهێنم کە بە ڕێکەوت لێم خوێندوونەتەوە، ستەمێک بەرانبەر کەسانی دیکە دەکەم کە لێم نەخوێندوونەتەوە و ئەمانەش زۆرینەن. لەوانەیە باشترین کارێک بە من بکرێت بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە، ڕاسپاردنیەتی بە نووسینێکی شێخ جەلال حەنەفی[146] کە دەربارەی دوو عیراقییە بە فەیلەسووفیان دەزانێت هەر یەک لە بوارێکدا.

ڕێسای «لادەر بە دەناسرێیت»[147] لای من پەسەند نییە. من چۆن دڵنیا بم لەوەی باوەڕی ڕەتکراوە هەر خۆی باوەڕە دروستەکە نییە؟ دەستەبەر چییە بۆ ئەوەی مشتومڕێکی لە بارودۆخی وەهادا دەوروژێت، دەبێتە مایەی سوود نەک گۆمڕایی؟ ئەم بوارە ڕاستینەی خۆی هەیە، بۆ نموونە: پێشەنگی و پەیدۆزیی نوێ پێویستی بە کەشی

---

145- بەرداکۆکی: داکۆکی هەڵبگرێت - قابل للدفاع عنه.

146- الشيخ جلال الحنفي (1914-2006) نووسەرێکی فرەزانی بەغدایە.

147- «لادەر بە دەناسرێیت»: «خالف تعرف».

ناگرژ و دەروونی ئارام هەیە، پێویستی بە ئازادیی دەربڕین هەیە و بە ڕێگەی ئاسان بۆ گەیاندنی بیروڕا بە خەڵک، پێویستی بە دەروازەی کراوە هەیە بەڕووی فەرهەنگی دیکەدا. ئەوجا دەبێ پێگەی «داهێنەر» لە بواری هزر و فەرهەنگدا لە ڕێکاری فەرمی و گەلێردا هەر نەبێ بگاتە ئاستی یاریزانی فووتبۆڵ، ئەمەش ئاواتێکە دوورەدەست.

## 18) ڕەخنە لە ڕۆژنامەگەریی عیراقی چییە؟

ڕۆژنامەگەری لای ئێمە بەشێکە لە دەزگەی ڕاگەیاندن، بەشێکی چالاکی خاوەن ڕەهەند و نێوپێو بۆ پەخشانی بۆچوونی فەرمی دەربارەی هەر دۆزێکی کەمێک گرینگیی هەبێت. بەوەش بزاوتنی، گواستنەوەی، دەربڕینی ئەم ڕۆژنامەگەرییە لە چێوەی ئەو سیاسەتەدا دەمێنێ کە دەستەبەر و ڕاگەیاندراوە. ئەمیش هەر وەک ئەو حیزبە مۆڵەتدارانە کە دەبنە پەلوپۆ بۆ «حیزبی بەعس - حزب البعث العربي الاشتراكي» ی خاوەن «17-30 تەمووز 1968» کە وەک گشت حیزبێکی دیکەی شۆڕشگێڕ ڕایگەیاندوە کە هاتووە بۆ ئەوەی بمێنێ. ئەم حیزبە ئەنجومەنێکی سەرۆکایەتیی شۆڕشگێڕ ڕێبەرایەتی دەکات و لە هەموو کاروبارێکدا خاوەن بڕیاری یەکەم و کۆتایە، بەشێوەیەکی ڕەها بۆ درشتەکان، وردەکانیش گەر مەبەستی بێ.

بڕیارەکانی «ئەنجومەنی ڕێبەرایەتیی شۆڕش — مجلس قيادة الثورة» مشتومڕ هەڵناگرن، بەڵکوو هەم دەستوورن، هەم فەرمانی دادگەن هەم جێبەجێ کردن. کەواتە ڕۆژنامەگەری لای ئێمە بە ئەنجامگیریی ئەم ڕوانگەیە دەکاتەوە گواستنەوەی بیروڕای دەوڵەت، هەر وەک چۆن تەلەڤیزیۆن و ڕادیۆ دەیگوازنەوە، ئەوجا بە پەراوێزی نمایشکاری و بیانووکاری دەورەی دەدات و لەمەشدا هونەر و بلیمەتیی خۆی دەخاتە

کار. لەم کارەشدا هیچ ڕێگەیەکی دیکەی نییە بیگرێتە بەر و تەنانەت بیریشی لێ ناکاتەوە چونکە ملکەچ کردن بۆ فەرمانەکانی سەرۆکایەتیی بەرپرس دەکاتەوە پێوەری نیشتیمانپەروەری و دڵسۆزی بۆ گەل و میللەت و هەروەها بەهای باڵا لە شکۆمەندیی مێژوودا.

لەم مەیدانە بەرین و گرینگەدا ڕۆژنامەگەریی ئێمە نۆرەیەکی سەربەخۆی نییە، ئەمەش دیاردەیەکی ڕیزپەڕ نییە گەر لە ڕوانگەی ئەم دوو ڕاستینەیەوە سەیری بکەین: یەکەمیان ئەوەیە لەسەرەوە ئاماژەم پێ دا کە ڕۆژنامەگەری لە گشت وەڵاتێکی شۆڕشگێڕدا دەبێتە زمانی دەسەڵاتە شۆڕشگێڕەکە یان لە پاڵ دەستاوێژەکانی دیکەی ڕاگەیاندن و بەیان کردن دەبێتە یەکێک لە زمانەکانی ئەو دەسەڵاتە. بەوەش پێگەی ڕۆژنامەگەری هەر وەک پێگەی بابای پۆستەچی و ئامێری تەلەفۆنی لێ دێت کە ئەرکیان سنوورداره بە گواستنەوە و گەیاندن.

تەنانەت بابەتی سەربە بواری فەرهەنگیی گشتیش تەنها لە هێڵێکدا دەخرێنە بەرباس هاوشان بێت لەگەڵ هێڵی سیاسەتی گشتیدا چونکە شۆڕش هەتا هەناسەی تێدا بێ هەر خۆڕسک سیاسەتێکی گەرم و سووتێنەرە. ئەوەتا لە ئەتیوپیا و ئەفغانستان و دەوڵەتانی دیکەی شۆڕشگێڕ هەر خۆیەتی دەبێتە سیاسەت، جڤاک و ئابووری هەتا بە هۆی هەلومەرجی لەخۆ گەورەتر نۆرەی نامێنێ.

ڕاستینەی دووەمیش ئەوەیە کە مێژووی عارەبایەتی و ئیسلام ئەوەتەی هەن بۆ تاکە جارێکیش ئەزموونێکیان نەبووە دەسەڵات ڕێ بە ڕەخنە گرتن و لێ ڕاسان بدات. تەماشای ڕۆژنامەی دینیی ئەم ڕۆژگارە بکە دەبینی پەنا دەباتە بەر لۆژیکێک داوای دەسەڵاتێک دەکات جیاوازیی بیروڕای تێدا نەبێ. تەنانەت «شورا» ش هەرگیز ئاوڕدانەوە نەبووە لە بۆچوونی زۆرینە، ئەوەتا خەلیفەی سێیەم لە نێوان

شەش کەسدا هاتە هەڵبژاردن، خۆ کەس پرسی بە خەڵکی «مەدینەی مونەوەرە – المدينة المنورة» نەکرد گەرچی لەوێ ئامادە بوون و دەکرا پرسیان پێ بکرێت. بیانوو بۆ ئەو دیاردەیە زۆرن و لەوانەیشە دروست بن بەڵام لە ئەنجامدا هەر دەبنەوە بەڵگەی نەبوونی شوورا لە مێژووی ڕۆژهەڵاتدا. کاری ئێمەش لێرەدا تەنها نمایشی داکەوتێکی زیندووە بە ڕۆژنامەگەریی خۆیەوە نەک پێشکەش کردنی چارەسەر و بژارە.

بەبیرم دێ چەند ساڵێک بەر لە ئێستا بەرپرسێکی هەرە گەورەی عیراقی بەرانبەر کەسانێکی میوان لە وەڵاتێکی عارەبییەوە هاتبوون، ڕایگەیاند کە ڕۆژنامەگەری لە وەڵاتی ئەوان باشترە. دیارە ناچاریی فەرمانی خۆی هەیە.

**19)** [بزرە...]

**20)** [بزرە...]

### 21) زەمەنی نووسەر...؟

دیسان بە دیار مەبەستی پرسیارەکەتەوە سەرگەردانم. ئایە مەبەست «تەمەنی نووسیارەتی»[148] یە کە دەکاتەوە ئەو ساڵانەی بە نووسین بەسەر براون و پاشان نووسەر خانەنشین بووە؟ یان مەبەست چەمکی باوە لە «زەمەن» بەڵام لە ڕوانگەی نووسەرەوە کە دێت و ژمێرکاری بۆ زەمەن دەکات: لە ڕووی مەودا و نێوەڕۆکەوە ڕێژەی زەمەن چەندە بۆ گرینگیی «ڕووداو»، «ئاشکرابوون»، «هەڵوێست»، «دەردەسەری» و «بەرەژان»؟

---

148- «تەمەنی نووسیارەتی»: «العمر الكتابي».

مەبەستی پرسیار هەر کامیان بێ، ڕاستییەکەی ئەوەیە من لە پێگەی کەنارگیریی خۆمەوە کە ڕەوتی سەعات و ڕۆژان تێیدا گرینگیی نییە، ڕێم داوە زەمەن لە بزاوتنەوە بە شێوەی فیزیکی بێتە زان و پاشان، بەپێی سووڕانی زەوی بە دەوری خۆردا و خوولانەوەی بەدەوری خۆیدا، بەسەر ساڵ، مانگ و ڕۆژدا دابەش بێت. ئەم سووڕانەوە و خوولانەوەیەش لە لایەن مرۆڤەوە دەبێتە مایەی سەرنج و دەبێتە خاوەن خەسڵەتگەلی مانگانە، هەفتانە و ڕۆژانە، هەروەها گەنجینەیەک لە ناو، ناونیشان و تیۆری دەربارەی ڕەهەندی چوارەم، زەمەنی پاشەکشێن، خۆگورجێن و خۆخاوکێن[149] بە ڕێژەیەکی پێچەوانە لەگەڵ تیژڕەویی ماددەدا. ئەم زەمەنەشم جێ دەهێڵم بۆ دەستنەسرەوتیی فیزیاناسان و ئەستێرەناسان، بۆ دەستنەسرەوتیی زەمەن خۆی بە ئێمە، ئێمەی نێو هەناوی پێوار، ئێمەی هاتووینەتە دونیا، ئێمەی بەسەرچوو... جێی دەهێڵم خۆی بێت، هەبوونێکی «ڕاستینە» بێت، «خەیاڵزادە»[150] بێت یان «پووچینە»[151]، لەبەر ئەوەی دەکرێ لە لێکدانەوەدا وەلا بنرێ هەر وەک سێبەری ماددە. سێبەر پووچینەیە، یان وەک ڕووبەری ماددە، ڕووبەریش پووچینەیە، یان مەودا، ئەویش هەر پووچینەیە. چونکە ئەم بابەتانە بوونێکیان لە نێو خۆدا نییە لە دەرەوەی ماددە، بگرە تەنانەت بە بوونی ماددەشەوە ئەمانە بوونی ڕاستییان نییە. ئەمانە خەیاڵزادە و ناون پەیوەند بە ماددە و بنەماکانی ماددە. خۆ پووچینە خۆیشی بوونی نییە مەگەر ئەو ناوەی بە واتاکێشەکێ لە «هەبوون» ـەوە پەیدایە.

---

149- زاراوەی «پاشەکشێن، خۆگورجێن و خۆخاوکێن» بەرانبەر «متراجع، متسارع، متباطئ» دانراون.

150- خەیاڵزادە: إعتباري.

151- پووچینە: عدم.

«شەو» لە ڕاستیدا نییە چونکە بریتییە لە بەسەرچوونی ڕۆژ، بوونی ڕۆژیش بەندە بە بوونی تیشکی خۆرەوە. تیشکی خۆر هەبوونێکی «ڕاستینە»یە، خاوەن کێش و گەرمایی. گوتنی درۆ هەیە بەڵام درۆ بوونی نییە مەگەر بوونێکی «خەیاڵزادە».

کەواتە دەرکی من بۆ زەمەن لە دوو ڕوانگەی «خەیاڵزادە» و «پووچینە» وەیە. من بە زەمەن پیر نابم بەڵکوو بەو کارە بەردەوامەی لەشم دەیکات، بە هۆکاری سروشتکرد، بە گەرما و سەرما، بە نەخۆشی و بابەتی لەو جۆرانە. هەر ئەم ڕاستییەشە بۆتە سەرچاوە بۆ بیرۆکەی «تەزاندنی لەش» و زیندوو کردنەوەی پاش سەد ساڵ یان هەزار.

بەڵام ئێمە ناتوانین دەستبەرداری چەمکی «زەمەن» بین چونکە پێویستمان پێیەتی ڕێک وەک پێوستیمانە بە ناوی خۆمان کە لە ڕاستیدا هیچ نین، هیچ جیاوازییەک نییە لە نێوان ئەوەی بڵێیت «دڵشاد وەرە» یان بڵێی «تۆی کە لە سەرەدا، لە لای ڕاستەوە چوارەم کەسیت وەرە» گەر دڵشاد ئەو چوارەمە بێت. چ ناوی بگۆڕیت چ ڕیزبەندییەکەی هیچ لە خۆیدا ناگۆڕیت.

هەر لەبەر ئەوەی دیدی من بۆ زەمەن خەیاڵزادەی ڕەهایە، ئارام نابم بەوەی ئاپۆرەی خەڵک وشەکەی وەک بوونێکی ڕاستینە بەکار بەرن. بەڵام کە فیزیا دێت و بە «ڕەهەندی چوارەم» ناوزەدی دەکات بەو کارە چ بوونێکی پێ نابەخشێت چونکە سێ ڕەهەندەکەی دیکەش چ بوونێکی ڕاستینەیان نییە.

من لەو دیاردەی چاوفریودانەی هەیە لە زاراوەی زەمەندا، ڕەخساوم و هیوادارم گشت خەڵکیش لێی بڕەخسێن.

### 22) بۆچوونت دەربارەی شیعری ئازاد؟

شیعری ئازاد لە نشیمەنی نەسازییە ئێسکسووکەکان سەری هەڵدا، واتە ڕۆژاوا. من بۆچوونێکی نایەتیم بەرانبەری نییە بەڵام نایسەلمێنین شیعری ئازاد ببێتە ئامرازێک بۆ دوژمنایەتی شیعری ستوونی.
«عەققاد» لەم بوارەدا گوتەیەکی هەیە شایانی ئەوەیە ببێتە دابڕی ئەم مشتومڕە، دەڵێ: خۆ شیعری تەراز[152] زیندانی هزر نەبوو هەتا دوژمنایەتی بکرێت بەڵکوو سەرشارێک بوو بۆ دەربڕین... ئەوەی پێی وایە کەسی گۆیا شاعیری شیعری ئازادە لە ئاست شاعیری شیعری تەرازدا، لە ئافراندندا تواناترە و لە نوێکاریدا تیژترە، هەڵەی فەرموو. لە ڕاستیشدا ناونیشان چ پێشەمییەک نابەخشێتە نە شێواز و نە نێوەڕۆک، لێشیان زەوت ناکات. نوێکار نوێکارە و شکەستیش شکەستە.

ڕەخنەیەکیش هەیە بەرۆکی شاعیرانی شیعری ئازاد دەگرێتەوە نەک شیعرەکە خۆی، ئەویش پەنا بردنە بەر ناڕوونی و دژواریی دەرک کردنە، ئەوەتا تەمپۆشی، بە پێداگریی شاعیرانی نەک لە سروشتی شیعرەکەوە، بۆتە خەسڵەتیکی شیعری ئازاد. زیادەڕۆییش ناکەم گەر بڵێم زمانی عارەبی بەو ئیعراب و ڕەوانبێژییەی هەیەتی مەیلی شیعری ستوونی زیادترە وەک لە ئازاد هەر وەک زمانی لاتینیی کۆن و ئاڤێستا کە پێم وانییە ملیان بۆ شیعری ئازاد دابێ. زمانی «عارەبیی نەحوی» بەژنی بەر لە 1400 ساڵی خۆی پاراستووە، ئەو زەمانە لە سەردەمی ساسانیدا ئاڤێستا زمانی ڕێوڕەسمی دینی بوو، زمانی لاتینیش جێی بایەخدانی فەرهەنگی باڵا بوو. لەبەر ئەوەیە بەراورد لە نێوان زمانی عارەبی و ئەو دوو زمانەدا کارێکی لەبارە. بەڵام لە ڕووی گونجان بۆ شیعر زمانی عارەبیی نەحوی هەتا ئەمڕۆ پێگەی دینی و دونیایی خۆی پاراستووە، کەچی زاراوە ناوچەییەکان گرینگییەکی ئەوتۆیان نییە

---

152- شیعری تەراز: شعر عروضي.

مەگەر لای ئاپۆرەی گشتیی نەبێ کە لە زمانی یەکتر تێناگەن و نابنە ئەو کۆکەرەوەی میللەتی عارەب کۆ بکاتەوە و لای فەرهەنگی جیهانی ببێتە گیانی عارەبایەتی و فەرهەنگنامەی ژیاریی وی.

لە ڕاستیدا ئەوانەی داوایان دەکرد سەردەستی بدرێتە زمانی ئاپۆرە، دەستەیەک بوون ئارەزوویان هەبوو مەیلی «چین» ی ژێردەستەی جڤاکی و ئابووری ڕاکێشن لە دیدێکی ساکارەوە گۆیا ئەمە ڕێگەی برایەتیی گەلانە. خۆ دیارە کە پێداگریی لەسەر زاراوەی ناوچەیی بە پلەی یەکەم یەکیەتیی میللەت لەنێو دەبات بە نەهێشتنی ئامرازێکی لێکگەیشتنی هەمەپۆش و گشتی. گەر لێکگەیشتن لە نێوان دیمەشقی، مەککی و جەزائیری دژوار بوو ئەوا لێکگەیشتنیان هەر لە بنەڕەتەوە نییە لەگەڵ دانیشتوانی هاییتی، ناوەندی ئەورووپا و ئەمەریکای ناوەند، چین و ژاپۆن...

وێرای هەر شتێک، شیعری ئازاد دەستاوێژێکی نوێیە بۆ دەربڕین، وەک چۆن سوریالی و کوبیزم[153] لە چەند ڕشتەیەکی هونەردا ڕێچکەی جیاوازیان گرت، ئەمیش ڕێچکەی خۆی گرت و گشتیان دەچنە خانەی هێماگەرییەوە گەر بەراورد بکرێن بە هونەر و ئەدەبی وەها خۆڕسک گوێزرابنەوە بۆ ئەم سەردەمە، ئەمانە هێشتا هەر بەردەرک[154]، بەسوود و خۆراکبەخش[155] ماون، توانای نوێکاریشیان هەیە بە ڕادەی شیعری ئازاد ڕێبازی گەیاندن پەیدا بکەن.

---

153- کوبیزم: خشتەکی - تكعيبي - Cubism. یەکەم شێوازی دەرهەست (ئابستراکت) بوو لە هونەری سەدەی بیستەم.

154- بەردەرک: مفهوم.

155- خۆراکبەخش: مغذية.

ئاشکرایشە کە هێماگەری بۆ دەربڕین لە بیرۆکەی «دەرهەست» پەنا بۆ ڕەنگ و ئاواز بەرێت سەرکەوتووترە وەک لە ئامرازێک «گوتن» بەکار بهێنێت، چونکە لەمیاندا «دەرهەستاندن» سنووردار دەبێ بە واتا وشە کەچی ڕەنگ و ئاواز واتای دیاریکراویان نییە تا سنووربەزێنی لێیان سەخت بێت. لەبەر ئەوەشە شیعری ئازاد گەرچی سەختە بەڵام هێشتا بەردەرکە و خزمایەتیی هەیە لەگەڵ شیعری ستوونیدا. دەبا گوڵ بە سەدان شکۆفە بکات.

**23) [بزرە...]**

**24) [بزرە...]**

**25) [بزرە...]**

**26) نهێنیی نووسەر، نهێنییەکانی خۆت؟**

نووسەر بۆ ئەوەی هێندە زانیار گرد بکاتەوە زیادتر بێت لەوەی بۆ پەخشان کردن پێویستیەتی و پاشەکەوتی بکات بۆ خۆی، دەبێ لە بواری کۆ کردنەوە، پەیدۆزی و نوێکاریدا مەودای بەرین ببڕێت، ئەوەتا نووسەری بەدبەخت لە ویژەنگ و هەڵبەستنەوە بابەتێک پەیدا دەکات شایستەی نووسین بێت، چ بۆ پەیدا کردنی بژێو بێت چ بۆ هەرمانی ناو.

نووسەر هەیە بەزۆر خۆی دەترنجێنێتە نێو دونیای ناودارانەوە، سواری کەشتییەکانیان دەبێ بۆ ئەوەی لەتەکیاندا بپەڕێتەوە بۆ دونیا ناوداری و گرینگیبوون. تەنانەت کەسێکی وەک «محەمەد حەسەنێن

هەیکەل»[156] گەرچی پێویستی بەوە نییە خۆی لەسەر گۆچانی کەسی دیکە ڕاگرێ، بۆنە دروست دەکات و شارەزایانە دەروازە دەکاتەوە بۆ خۆ بەیان کردنێکی بێتاوانانە تێیدا باس لەوە دەکات دۆستایەتیی هەیە لەگەڵ ناودارانی سەرزەوی. گەر خۆڕاپەرموونی خۆی بکردایەتە سەرشار و ئاشکرای کردبا کە هەوڵ دەدات بۆ دابین کردنی ئەو خواستەی هەیەتی بۆ ناسینی کەسانی مەزن هەم زۆر گونجاوتر دەهات لەگەڵ ئەو هەموو زیرەکییەی و ئەو ناودارییە سەرسوڕهێنەرەی هەم دەشی پاراست لە ڕەخنە، بگرە لە تواناکانیشی زیاد دەکرد. ئەمەیان لە دیدی منەوە و لەوانەیشە بە سەروسەودا لەتەک هۆش و دەرکی گشتیدا دیدی ئەو سوودبەخشتر بێت، بشبورێت، مەبەست ئەوە نییە زیانی پێ بگەیەنم، ئەوم بە نموونە هێنایەوە چونکە ناوی بەهێزە مشتومڕ دەبڕێت.

نهێنی نووسەر موڵکی خۆیەتی لەوانەیە مەبەست لە پاراستنی ئەوە بێت خۆی نەبێت موڵکی ئەو نهێنییە. تاکە وشە هەیە ماوەیەکی درێژخایەن یان کورتخایەنی بەس بێت بۆ تێکدانی هێلانەی ئاسوودە، خاوەنەکەی خۆی دەکاتە کۆیلە. لەوانەیشە ئەو لاپەڕانەی ژیان کە نووسەر بە نهێنی دەیان پارێزێت ببنە سەرچاوەی ئەو بەشە نایابانەی بەرهەمەکانی کە خەڵک پێی وایە زادەی بلیمەتیی نووسەرن و گەر ژێدەریان ئاشکرا بێت بەشێکی بریسکەیان تێدەچێت.

ئەوجا نهێنیش فرەجۆرن، هەیە ڕوویداوە، لە ژیانی خۆی یان کەسانی دیکەدا، بۆ چەپارەدانی خۆ و ئازیزان وەها باشە بپارێزرێن، لەوانەیشە ئاشکرا کردنی نهێنییەکە سوودی بۆ کەسی نەیار هەبێت، ئەوسا پاراستنی نهێنییەکە ڕوانگەیەکی نەیارانەی دەبێ. جاریش هەیە ئاشکرا

156- محمد حسنین هیکل (-1923) ناودارترین ڕۆژنامەنووسی دونیای میسر و عارەبە.

کردنی نهێنییەک دەبێتە پەیمانشکێنی و ڕۆمەتبەزێنی و هەتا کۆتای لیستێک لە چەندین جۆری ڕووداو کە ئاشکرا کردنیان دژوار و نارەوایە.

دەشبێ نهێنییەکە بۆچوون یان بیرۆکە، تیۆری یان باوەڕێک بێت هۆکاری بەهێز هەبن بۆ شاردنەوەی. کاتێکیش نهێنی لە ویژدانی هەڵگرەکەیدا شاراوە بێت، بڕیار دان لەسەر چاکە و خراپەی پاراستنی یان درکاندنی دەکەوێتە دەرەوەی بازنەی نرخاندن. بەڵام دەتوانم بڵێم ڕاگەیاندن بەگشتی – گەرچی زیانیشی هەبێت بۆ کەسێک یان چەند کەسێک – سوودی مرۆڤایەتی تێدایە. نووسەرانی ناودار هەن باسی شەرمەندەیان دەربارەی خۆیان بڵاو کردۆتەوە، بۆ نموونە فرانک هاریس[157] لە کتێبی «ژین و ئەڤینم» *My Life and Loves*، بیستوومە گۆیا ئەم کتێبە بووە هۆی ئەوەی بەر لە شۆڕشی ڕووسی، لینین دیداری نووسەرەکەی نەسەلماند.

نهێنیش لەم بوارەدا دوو پلەی هەیە: یەکیان نهێنی بێدەنگبوون و پەخش نەکردن، ئەوەی دیکە تەنها پەخش نەکردن، هەڵگری نهێنی بەپارێز یان نا، باسی لێ دەکات. گرینگیی پەخشان کردن گەورەترە لە هی گوتن بە ڕادەیەک نێزیک دەبێتەوە لە ئەمانەت، چونکە وشەی نووسراو گەر تایبەتمەندیی دیاریکراوی لەگەڵدا بێت ملیۆنێک جار لە ئەندازەی وشەکە خۆی گەورەتر دەبێت. جەنگ و شۆڕش هەن، دەوڵەت و پاشانشینی هەن بە هۆی وشەی نووسراوەوە ڕابوون و دارمان. دین هەن لە ڕێی وشەی نووسراوەوە باوەشیان بە چەندین ملیار مرۆڤدا کرد... و هتد.

نهێنییەکانی خۆیشم تەنها لای خۆم و لایەنی بەرانبەر مەبەستە، بەشێکیشیان خەونن ئاماژەی ئاڵۆسکاوی وەهایان تێدایە بۆ گوتن نابن،

---

157 - Frank Harris (1856-1931).

بەشێکی دیکەیان بیرۆکەن و بەلای خۆمەوە لە گشت نووسراوێکی بڵاوکراوەی هەتا ئێستام گرینگترن بەڵام کەمتوانای مادديم، وەک کەمیی کات و تەنگیی هۆش، لێیان بۆتە بەربەست. بەشێکیشیان توانای دەربڕینم لێیان نییە، زمانێکم نییە فەرهەنگنامەیەکی هەبێت خاوەن وشەگەلی وەها توانای هەبێت سۆبژەی من تەرجەمە بکات...

## 27) پرۆژەکانی ئایەندەت...؟

لەگەڵ بەردەوامبوونی ئەم بارودۆخەی ئێستا، بە هەلومەرجی چاپ، پەخشان، ئازادیی بزاوتن و دەربڕین و هەروەها کزیی دارایی هیچ جۆرە پرۆژەیەکم نییە و زەمینەی بوونیشی نییە مەگەر پێداگریی زۆر لە برایان بێت کە ئەوەی پێمە بینووسم و پەخشان کردنی وەلانرێت بۆ کاتێک توانا هەبێت. ئەمەش پێشنیازێکی ڕێزدارە و دروستییەکەشی لام ڕوونە گەر کەسیش پێشکەشی نەکات بەڵام دوو بەربەستی سەرەکیی هەیە: یەکیان دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی خۆم کە تەنبەڵی دەکەم لە نووسینی بەرهەمێک ڕووناکی بڵاو کردنەوە نەبینێت. ئەم تەنبەڵییەش دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی هاندانی دەروون، ئەو هاندانەی لە دنەی بڵاو کردنەوەدا هەیە چونکە گەرمایی ناوەکی کە دەبینێت گۆڕەپانێکی داوەستاوی سارد بەرانبەریێتی، خامۆش دەبێتەوە و دەنگی بزوێنی لەشگرانی گەرم دەبێت و دەڵێ: ئەو کارە بخە سبەی هەوڵی زیادە بۆچییە گەر پێویست نەبێ. تەماشای باخەوان بکە دەبینی سەوزە و بەرێکی زووتر بێتە بەرهەم پێش دەخات، بۆ زەیتوون و خورما خاوەخاو دەکات، چونکە دواکەوتنی یەک هەفتە بۆ تەماتە زیانی زیادترە لە یەک ساڵ دواخستنی برالەی[158] دارخوما چونکە دوور نییە

---

158- براله: فسيلة.

بەرهەمی برالەیەک بگاتەوە بە برالەیەکی ساڵێک زووتر. دەروونیش چۆن پەنا بۆ هۆکاری دنەدەر دەبات وەهایش پەنا بۆ هۆکاری سارد کردنەوە دەبات، هەر نەبێ من وەهام!

داواکاری هاتووە داوای نووسین دەکات دەربارەی کەسایەتییەکی کورد کە بردەی مەرگە. لەگەڵ داواکەدا خەڵاتی دڵکێش و دەرفەتی دوو ساڵ کاری بەدەمەوە بوو. جگە لەوە لە وەڵاتی سوێدی ئەورووپاوە داوام لێ کرا مۆڵەت بدەم یەک لە کتێبە کوردییەکانم چاپ بکرێتەوە، ئەمەیان چ ئەرکی بۆ من نەبوو، بە سوپاسەوە مۆڵەتم دان.

ئەو بابەتانەی دەشێ چەندین ساڵ خەریکم بکەن، زۆرن، بەشێکیان ژیاننامەن، بەشێکیان ئەدەبن و بەشێکیان ڕەخنە، ئەوجا لە هەموان ئاڵۆتر هزرە کە مەیدانێکی فرە فرە بەرین و قووڵ دەگرێتەوە تێیدا پێویستم هەیە بە توانای فرەوان و ئازادیی فرەوانتر، بە هاوکاری هەیە کە نین، بە سەرچاوەی مەزن هەیە کە لای ئێمە سەروبەر بزرە. سەرچاوە، لەبری ڕامانی دەرهەست چەندین مانگی درێژخایەن، بە وەڵامی ئامادە کاتم بۆ کورت دەکەنەوە.

هەتا ئێستا وەڵامێکی ئارامبەخشم نەدۆزیوەتەوە بۆ پرسیاری ساکاری وەک:

- ئایە سروشتی گەردوون ڕاستەکی[159] یان گۆیەکییە[160]؟ خۆم مەیلم لەوەیە بڵێم سروشتی وەها، گەر هەبن، ڕێژەیین و ڕاستینەی «ڕەهایی» گەردوون — کە پێم وایە لە سروشتی گەردووندا بەڵگەنەویستە - هەڵیان ناگرێت.

---

159- ڕاستەکی: مستقیم.

160- گۆیەکی: متکورة.

- ئایە ڕاستینەی «ناچارەتی»[161] بەرانبەر و مەوداکەی بە بەراورد لەگەڵ نەبوونی ناچارەتی. لەوەی ڕوو دەدات و ڕوو نادات، بەتایبەتی لە دونیای زیندەوەراندا و دیسان بەتایبەتی لە دونیای هۆشدا کە دەکاتەوە مرۆڤ؟
- مەودای نۆرەی «ویست»[162] چەندە لە جڵەو گرتنی «ناچارەتی» دا، چ ڕێبەستن بێ، چ ڕێپێدان و چ ناچاری؟
- ڕادەی ئازادبوونی «ویست» لە ڕێساگەلی فیزیا و لە هێزە دیار و نادیارەکانی سروشت. مەودای ڕۆچوونی ئەم هێزانە لە ناخە دێرینەکاندا و پەیوەستی کۆتایان بە «ڕەها»وە؟
- پەیوەستی گەردوون، کامەیە سروشتی و کامەیە دەستاوێژی، یان کامەیە دەستاوێژی کۆن بۆ ڕاستاندنی ئەو پەیوەستە؟ چونکە تێکبەستنی پەلوباڵ گەر ڕەهەندەکانیان بێکۆتا بن لە کردن نایەت مەگەر خێراییەکی ڕەها بوونی هەبێت پەیوەستبوون تێیدا دروست بێت دەنا لە بنەڕەتەوە پەیوەستبوون چ واتایەکی پێوە نامێنێ. ئەوسایش «هیچایەتی»[163] دەبێتە یاسا بوون.
- ئەوجا «هیچایەتی» چۆن دەچێتە تەرازکاریی[164] کاراوە خۆ ئێمە بە شرۆڤەی شەبەنگ دەزانین کە سروشتی فڵانە ماددەی بیست ملیار تیشکەساڵ[165] تەمەنیەتی هەر لەو سروشتەیە لە نووکی ئەم خامەیەدا هەیە پێی دەنووسم؟

---

161- ناچارەتی: الحتمية - Determinism.

162- ویست: إرادة.

163- هیچایەتی: عبث - Absurdism.

164- تەرازکاری: موازنات.

165- تیشکەساڵ: سنة ظوئية.

گەردوون جار هەیە وەها خۆ دەنوێنێت هەر دەڵێی دڵەترپەیەکی بوونە، یان ڕادەست کردنێکی مەزنی بێکۆتایە، ژمێرکاریی چەند و چۆنی زەمان و زەمینی کەی و لە کوێ، تێیدا بزر دەبن.

من لە کوێی ئەو هەمووەدا هەم؟ لە کوێی پشت ئەو هەمووەدا هەم کە نە دەربڕین دەروەستی دێت و نە وێژەنگی تیژڕەو؟ ئاخاوتنم ئاوێتەی وڕێنەیە...

«...»